# بیروباوەڕی

# شیعەی دوانزە ئیمامی بناسە


نوسینی

ف.أ. باوكی عائیشه



٤/ ذي القعدة/ ١٤٣٢ ك.          ٢/١٠/٢٠١١ز

# بیروباوەڕی
# شیعەی دوانزە ئیمامی



سوپاس‌و ستایشێکی بێ پایان بۆ ئەو خوایەی کە خۆشەویستی خۆی‌و پێغەمبەرەکەی‌و خۆشەویستانی خۆی کرد بە بەشمان. صەلات‌و سەلامی خوای بەهێزو لێبوردە وەك لێزمەباران برژێ بەسەر گیانی پاکی پێغەمبەری رەوشت بەرز، ئەو پێغەمبەرەی کەوا وەك ڕەحمەت خوای گەورە ناردی بۆ ڕزگارکردنی هەموو بەشەریەت. ڕەزاو ڕەحمەتی خوای بەرزو بێهاوتا برژێ بەسەر گیانی دایکانی باوەڕداران‌و پشتیوانانی پێغەمبەری سەرەرو ئەوکەسانەی کەوا تاڕۆژی دوایی بەجوانی پەیڕەویان لێدەکەن‌و نزای خێریان بۆدەکەن.

برایـان‌و خوشـکانی خوێنـەر، بەنـدەکانی الله، سـەلام‌و ڕەحـەت‌و بەرەکـەتی خـوای گـەورەو میهرەبانتـان لێبـێ، خۆشەویسـتان لـە ڕۆژگـاری ئـەمڕۆدا چـین‌و توێـژو حیـزب‌و ئـەفکاری ڕەنگاوڕەنگمـان زۆرە، وەك مـەعلومی جەنابتانـە کەسیش بەدۆی خۆی نالّێ ترشـە، هـەموو حیـزب‌و پـارتێکیش بەوەی لای خۆیەتی دڵخۆش‌و گـەش بینـەو بەرامبەرەکـەی بـە سەر لێشێواو گومڕا دادەنێ:

﴿كُلُّ حِزْبِۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴾ المؤمنون: ٥٣ .

ئاخۆ دەگونجێ دووشـتی پێچـەوانەی یـەکتر هـەردووکیان ڕاست بن؟! پاك‌و پیس قەت وەك یـەك بوون؟! خـوای گـەورە وەڵامـی ئـەم پرسـیارەمان دەداتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿ قُل لَّا يَسْتَوِى ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِ ۚ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ المائدة: ١٠٠.

پیان بڵێ ئەی موحەممەد ﷺ: هەرگیز پاكو پیس وەك یەك نین ، واتە باوەڕدارو بێ باوەڕ هەرگیز وەكو یەك نین، با باوەڕدارانیش كەمو بێهێزیش بنو بێ باوەڕانیش زۆرو بەهێزبن، ئەگەرچی زۆری پیسیكەش سەر سامت بكات ، بەلام دڵنیابە خوا پاكەو پاكیش نەبێ نایەوێ، هێلكەیەكی خاوێن باشترە لە سەدان هێلەكەی پیس، دەی لە خوابترسن ئەی خاوەن هۆشان تا لە سەختیو نەهامەتیەكانی دوای مردنو زیندوو بوونەوە ڕزگارتان بوێ.

برایانو خوشكان ئەوەی كەمەبەستی ئێمەیە لێرانا ، ئەوەیە كەوا دەمانەوێ باسی بیروباوەڕی چینێكو تاقمێك لەو چینو تاقمانەبكەیەن كەوا ئەمڕۆ بە شیعەی دوانزە ئیمام ناسراونو دەبینرێن، ئەم چینەش لە هەموو سەر زەویدا بەگشتی كەسو كاری خۆیان هەیەو بەتایبەتی لە ئێرانو عێراقداو خاوەنی بیروباوەڕێكی تایبەتنو جیاوازن لەهەموو چینو توێژەكانی تر، بەتایبەتی لە سوننە مەزهەبەكان.

## پێشەکی چاپی دووەم:

بەناوی خوای بەخشندەو زانا، سوپاس و سەنا بۆپەروەردگاری کاربەجێ و دانا، سەلات و سەلام لەپێغەمبەری ڕەوشت بەرزو ڕەوانەکراوی خوای بەهێزو توانا، هەروەها لەسەر هاوسەرانی و دایکانی باوەڕداران و هاوەڵانی دڵسۆزو بوێرو بەتوانا، برایان و خوشکانی خوێنەر سەلامی خوای بەخشندەو میهرەبانتان لێبێت، من وەك نوسەرێکی فەریکەو بێ توانا هەرگیس چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد کەوا ئەم نامیلکەیە بەوجۆرەی کەدوای دەرچونی قەبوڵکرا قەبوڵبکرێت، بەڵام سوپاسێکی بێ ئەندازە بۆئەوزاتەی کەکارو کۆششی بەندەکانی بەزایە نادات زۆر لەوەزیاتر، یان بەپێچەوانەی بۆچونی من ئەم نامیلکەیە جێی خۆی کردەوە لەناو خوێنەرانی عەودالی ڕاستیدا.

هەروەها فەرەحناییەکی زۆری بەدڵم بەخشی، ئەم فەرەحنایەش لەبەرئەوەبوو کەوا بۆمدەرکەوت کەهێشتاوەکو

کەسانێکی زۆر هەن بەدوای ڕاستیەکاندا بگەڕێن‌و بیانەوێ ڕاستی بەدەست بێنن، یان بڵێین هێشتا کەسانێك هەن بیانەوێ دوژمنانی پێغەمبەرﷺ و ئال‌و یارو یاوەرانی پێغەمبەرەکەیان بناسن.

بۆیە ئەمانە بونە هۆکاری ئەوەی هەستم بەلەچاپدانەوەی ئەم نامیلکەیەو بیخەمەوە بەردەستی ئێوەی ئازیزو عەودالی ڕاستی‌و کەم دەستکاری کردنێك بکەم تێیدا، ئەمەش تەنها لەئاماژەکردن بەهەندێك لەژمارەو سەرچاوەکان‌و ناوی دوانزەئیمەکانی شیعەی دوانزە ئیمامی.

هەروەها داواکارم لەهەموو کەسێك لەئاستی خۆیدا بلێت‌و بدوێت سەبارەت بەنەگریسی ئەمانەو تابونیان بەردەوامبن، چونکە بەڕاستی ئەگەربێت‌و ئێمە بگەڕێینەوە بۆ مێژو ئەوا دەزانین ئەمانە چکارەساتێك‌و کۆسپێك بوون لەسەرێگای ئیسلام‌و پەیامەکەی خواداو چەن بێشەرم‌و بێ ڕەوشت بوون سەبارەت بەپێغەمبەرەکەی خواﷺ، ئێستاش بەچاوی خۆتان

دەبینن لەسوریا چی بەمسوڵمانان دەکرێتو ئەسەدی بەعسی عەلەوی بەپاڵپشتی ئێرانو حیزبو شەیتانی لبنانن چ قەسابخانەیەکی بەبەرچاوی هەموو جیاهەنەوە داناوەو هیچ وڵاتێکی نەڕۆژئاوایی و نەڕۆژ هەڵاتی لەبەرئێران ناتوانن دەنگ بکەن، پێویست ناکات باسی مستەمسەك بکەین چونکە لەبەرچاوی هەمووتانەو دەیبینن.

هەرلەبەر ئەوەی ئێوە بزانن ئەمانە چەندەزیانیان بەوڵاتی ئیسلامیو مسوڵمانان گەیاندووە بەسەرهاتێك، کارەساتێکی مێژوویتان بۆ دەگوێزمەوە:

## قەسابخانەکەی بەغدادو کوشتنی خەلیفەی عەبباسی المستعصم لەسەردەستی وەزیرە شیعیەکەی ئیبن عەلقەمی _ نەفرەتی خوای لێبێت:

لەساڵی ٦٥٦ك وەزیر ئیبن عەلقەمی شیعە(نەفەرەتی خوالێبێت) نوسراوێکی بەنهێنی نوسی بۆ هۆلاکۆ پاشای تەتەر، پێی وت: ئەگەر تۆدێیت بۆ بەغداد ئەوامن دەیدەمە

دەســـتت، هۆلاکـــۆش وەلامیدایـــەوەو وتـــی: بەڕاســـتی سـەربازەکانی بەغـداد زۆرن جانەگـەر تۆڕاسـتدەکەی لـەوەی کـەدەیلێیت‌و دێیتـــەناو بازنـــەی گوێڕایـــەڵی ئێمـــەوە، ئـــەوا سەربازەکانی بەغداد پەرژو بڵاو بکە، وەئێمەش ئامادەدەبین.

لەوکاتـەدا وەزیـرە شـیعیەکە ئامـاژەی کـرد بۆمستعصـیم خەلیفـــەی عەبباســـی، بەپشـــودان‌و مۆڵـــەتی حەوانـــەوە بەژمارەیەکی زۆر لەوسەربازانەی کەوا لەپایتـەختی خەلافـەتی بەغــداد ئامــادەکرابون بۆجــەنگ، بــەبیانوی کەمکردنــەوەی بارگرانی ماڵی لەسەر دەوڵەتی عەبباسی، خەلیفەش لەوکاتەدا _نەیزانی پیلانەو وەزیرەکەی وەجاغزادەی عەبدوڵڵای کـوڕی ســەبەئە_ بۆیــە ڕازی بــونی خــۆی لەســەرئەمکارەدەربڕی، هەردەسبەجێ‌و بێ دواکەوتن وەزیری شـیعی دەرچـو، هەسـتا بەســڕینەوەی نــاوی پــانزە هــەزار ســەرباز لەســەربازەکانی بەغـداد، پاشـان لەبەغـداد دەریکـردن‌و نـەی هێشـت لـەوێ بمێننەوە، پاشان دوای مانگێك هـەمان کـاری پێشـوی ئـەنجام دایـەوە، هەسـتا بەسـڕینەوەی نـاوی بیسـت هـەزار سـەرباز

لەسجیلی سەربازەکاندا، بەرداوامبوو ئەم وەزیرە پیسە شیعیە کۆششی دەکرد لەبڵاوەپێکردنی جەیشی ئەهلی سوننە، سڕینەوەی ناویان لەسجیلی سەربازیدا، هەتاوەکو وایلێهات ژمارەی ناوە تۆمارکراوەکان لەسجیلی سەربازەکاندا دەهەزار کەس مایەوە، لەدوای ئەوەی کەوا لەکۆتایین ڕۆژی خەلیفە موستەنصیردا زیاتر لەسەد هەزار شەڕکەری ئەهلی سوننەبون، لەوکاتەدا سەرلەشکری تەتەر هۆلاکۆ ڕوی کردە بەغداد لەجیهەتی وشکانی ڕۆژهەڵاتەوەو دەوری بەغدادی دا، جا وەزیری شیعە ئاماژەی دا بەخەلیفەی عەبباسی بەوەی کەوا موصاڵەحەو ڕێکەوتنیان لەگەڵدا بکات، پێی وت: من دەردەچم‌و دەچم بۆلایان لەبەر ڕێکەوتن، هەستاچوو متمانەی بەخۆی‌و کۆمەڵەکەی هەبو،ئینجا گەڕایەوە بۆلای خەلیفەو وتی: ئەی گەورەمان پێشەوای باوەڕداران بەڕاستی سوڵتان دەیەوێت کچەکەی بدات بەکوڕەکەی تۆ پێشەوا ئەبوبەکر، لەجێگای خۆت‌و خەلافەتدا بمێنیتەوە.

لەبەرئەمە مستعصیم خەلیفەی عەبباسی فریوخوارد بەوەزیرەخائینەکەی‌و هەستا چوبۆلای لەگەڵ وەزیرەکەی‌و حەوسەد سواردا لەدادوەرو زاناو فرمانڕەواو پیاوی دەوڵەت‌و ناوداری پایتەخدا، لەئەهلی سوننە، کاتێك کەوا نێزیك بونەوە لەجێگای جێگیربونی هۆلاکۆی خوێن ڕێژ، دەستیانگرت بەسەر هەرهەمویاندا جگە لەحەفدەکەسیان، جاخەلیفەی عەبباسی چووەلای هۆلاکۆ لەگەڵ ئەو حەفدەکەسەدا، هەمویان دابەزێنران لەسەر سوارەکانیان‌و چەکران‌و پاشان هەمویانیان کوشتن، پاشان کوڕەکانی خەلیفەیان هێنان‌و لەبەرچاوی هەمویانا لەگەردنیان درا.

بەڵام خەلیفەی عەبباسی، وتراوە شەوهۆلاکۆ داوایکر بیهێنن بۆلای، پاشان فرمانی کوشتنی دا بەڵام کەسەتایبەتمەن‌و پرس‌وڕاپێکراوەکانی هۆلاکۆ وتیان: بەڕاستی ئەگەر ئەمە خوێنی بڕێژرێت دونیا تاریك دەبێت، چونکە ئەو ئامۆزای پێغەمبەری خوایەﷺ، لەبەرئەمە هۆلاکۆ ترسا

کەبیکوژێت، لەوکاتەدا نەصرەددینی توسی پیسی شیعە هەستایە سەرپێ و وتی: دەکوژرێت و خوێنیشی ناڕژێت.

وتیان: چۆن؟

وتی: بیپێچن بەبەڕەیەکەوەو لولیدەن هەتاوەکو گیانی دەردەچێت، ئەوکات خوێنی ناڕژێت، ئەوانیش هەستان وایانکرد.

ئەمانە لەهۆلاکۆ خراپترن بۆ مسولْمان و ئەهلی سوننەو چاکتر دەستیان دەچێتە خوێنی شوێنکەوتوانی پێغەمبەر موحەممەدﷺ، ئێستاش بەچاوی خۆتان وڵاتی سوریادەبینن کەچ قەسابخانەیەکی بۆسوننەکان داناوە، هەروەها خراپتر پیلان دادەنێن بۆ خاپورکردنی دەوڵەتی ئیسلامی، هەرچەندە تۆمتمانەیان پێ بکەیت ئەوان هەرمتمانەبەتۆناکەن و خۆشیان لەتۆنایەت، وەك خوای باشکۆ دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّواْ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِى صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١١٨﴾ هَٰٓأَنتُمْ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ بِٱلْكِتَٰبِ كُلِّهِۦ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ عَضُّواْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَنَامِلَ مِنَ ٱلْغَيْظِ قُلْ مُوتُواْ بِغَيْظِكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ آل عمران: ١١٨ - ١١٩.

وەوتراوە بەڵکو خنکاندویانە، وەوتراوە بەڵکو خراوەتەناو ئاوو غەرقکراوە رحمه الله تعالی.

پاشان تەتار دەستیگرت بەسەر بەغدادی پایتەختی خەلافەتی ئیسلامیدا بەیارمەتی دووڕافضی پیسدا ئیبن علقەمیو نصيرالدين الطوسي، چونە ناو ماڵی خەلافەتەوەو زێڕو گەوهەرو خشڵو جەواهیراتو هەرچی شتی بەنرخ هەبو تالانیانکردو بردیان.

پاشـان کەوتنـەلا بـۆ ئـەهلی سـوننە لەبەغـدادا، هەسـتان بەکوشـتنی هــەموو ئەوانــەی دەسـتیان بەسـەریاندا هــەبو لـەپیاوان‌و ئافرەتـان‌و منـداڵ‌و پـیرو بەساڵاچـوان‌و گەنجانـدا، هەتاوەکو زۆرێك لەمسوڵمانان چونە ناو کادان‌و شوێنی پـیس‌و کاولبوو ئاژەڵانەوە، لەوکاتەی هەموو خـەڵی لەشـوێنەدا کۆبـو بونەوە، ئەوان هەستان دەرگایان لەسەر پێوەدان، ئینجا تەتار بەسەرکردایەتی ئیبن عەلقـەمی ناپاکـەوەهات، جادەرگاکـەیان شـکاند یـان بـەئاگر پێیانکردنـەوەو پاشـان چونەسـەریان‌و هەموویانیان کوشتن، هەتاوەکو بەجۆرێك خوێن بەکەلێنەکانـدا پلوسکەی گرتبـو، وەژمـارەی ئەوکەسانەی کـوژران گەیشـتە ملوێنێــك‌و هەشســـەد هەزارکــەس (١٨٠٠٠٠٠)ی مســـوڵمانی یەکتاپەرستی سوننی، لەسەردەستی نەسیرە ددینـی توسـیی ناپاکی شیعە، ئەوکەسەی خومـەینی لەکتێبەکەیـدا _الحكومـة الإسلامية صفحة ١٢٨ _ دەربارەی دەڵێت ئەمە دەقەکەیەتی:

(ويشعر الناس بالخسارة أيضـاً بفقـدان الخواجـة نصـير الدين الطوسي وأمثاله، ممـن قـدموا خـدمات جليلـة

للإسلام)واتە: خەڵکی بەهەمان شێوە هەست بەوەدەکەن بەلەدەستدانی گەورەپیاو نەصرەددینی توسیو هاوشێوەکانی، لەوانەی چەندین خزمەتی گەورەو بەنرخیان پێشکەش بەئیسلام کردووە. کتاب: موسوعة فرق الشيعة: (٧٥/١_٧٦). خۆشەویستان ئەمە کاری ئەم نەگریسو ناپاکانەیە، دەی نەکەی هەرگیز متمانەیان پێبکەیو کاریان بۆبکەیو لەکاری خۆتو مسوڵماناندا بەشداریان پێبکەیتو لەکارو باردا پرسو ڕایان لێوەرگریت، گەرنا وەك خەلافەتی عوسمانیت بەسەردێت. البداية والنهاية لابن كثير رحمه الله تعالى: سنة ست وخمسين وستمائة(٦٥٦).

الحمد لِلهِ ربِّ العالَمين حمدًا يُوافِي نِعمه ويُدافع نِقمه ويُكافأ مزيده.

ف.أ. باوكى عائيشه

٧ / ذي القعدة / ١٤٣٣ ك

## پێشەکی بابزانین مەبەستی ئێمە لە شیعەمەزهەبەکان کێیە:

د. عەلی موحەممەد صەلابی لە کتێبەکەی (سیرة أمير المؤمنين علي بن أبي طالب رضي الله عنه)دا بەم شێوەیە بۆمان باسدەکات ( ص، ٥٦٢_ ٥٧٢).

شیعە ( الرفض) لە زمان‌و زاراوەدا:

١_ شیعە لە زمانەوانیدا:

شيعة الرجل: شوێنکەوتوان‌و یاریدەدەرانی، وتراوە: شایعه: هەروەکو وتراوە: دۆستایەتی کردو کارەکانی گرتە ئەستۆ... وتشيع الرجل: واتە بانگێشەی شیعەی کرد، تشايع القوم: واتە بون بە شیعە، هەموو کەلێك کاروباریان یەکبوو هەندێکیان شوێن بۆچونی هەندێکیان کەوتن ئەوا ئەوان شیعەن، وەك فەرمایشتی خوای بلند مەقام: ﴿ كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ ﴾ سبأ: ٥٤.

واتە: هەروەکو کرا بە هاوشێوەکانیان لە گەلانی پێشو[1] لە (المصباح المنیر)دا هاتوە: شیعە بە شوێنکەوتوان و یاریدەدەران دەوترێت، هەموو گەلێك کۆببنەوە لە سەر یەکشت ئەوا ئەوان شیعەن و پێیان دەوترێ شیعە، پاشان شیعە بوو بە _ نبزًا_ واتە بوو بە وەصف _ بۆ کۆمەڵێکی تایبەت[2]، فالشیعة: شیعە لە ڕووی زمانەوانیەوە بەمەبەست و واتای: گەل و هاوەڵ و شوێنکەوتە و یاریدەدەر دێت.هەروەها ئەم واتایە هاتوە لە هەندێك لە ئایەتەکانی قورئانی بەڕێزدا هەروەکو لە فەرماییشتی خوای بڵند مەقامدا هاتوە: ﴿ فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦۖ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ ﴾ القصص: ١٥. هەروەها: ﴿ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴾ الصافات: ٨٣ . وشەی شیعە لە یەکەمدا بەواتای گەل هاتوە، لە دووەمدا: ئاماژە بەو

---

١ الصحاح للجوهري، ولسان العرب، شيع.

٢ المصباح المنير: شيع.

شوێنکەوتوانە دەکات کە هاودەنگن لەسەر بۆچون و پرۆگرام و هاوبەشن تیایاندا.

## ٢_ پێناسەی شیعە لە زاراوەدا:

بەڕاستی پێناسەی شیعە بەستراوە بە سەرەتاو پێکهاتنی پەیا بونیان و قۆناغی پێکهاتەی بیروبۆچونیان، بۆیە بەڕاستی لە سەرنجداندا ئەوەیە کە بیروباوەڕی شیعە و بۆچونیان لە گۆڕان و گەشەسەندنی بەردەوامدایە. شیعەکان لە سەدەی سەرەتاوە جگە لە شیعەکانی دوای خۆیانن، لەبەر ئەمەیە کە لە سەرەتای یەکەمدا ناویان بە شیعە نابرێ جگە لەو کەسانەی کە عەلیان پێش خستوە و داویانە بە سەر عوسماندا، هەر لەبەر ئەمەیە بێژراوە: شیعیەکان و عوسمانیەکان، شیعی ئەوانەن کە بەهای عەلی دەدەن بە سەر عوسماندا[٣]، لەسەر ئەمە پێناسەی شیعە دەکرێ لە سەرەتای

---

[٣] أصول الشيعة الإمامية(٣٦/١).

یەکەمدا: کەوا ئەوان ئەوکەسانەن کە ڕێزی عەلیان داوە بەسەر عوسماندا و بەس[٤]، هەر لەبەر ئەمەیە کە ئیبن تەیمیە باسی کردوە: بەڕاستی شیعەکانی سەرەتا ئەوانەی لە سەردەمی عەلیدا بون ئەوان ئەبوبەکرو عمریان بە چاکتردەزانی و[٥] شورەیکی کوڕی عەبدوڵلا لەمکارە ڕێگری لێکردن_ ئەو لەو کەسانەیە کە بە بانگ خوازی شیعە وەصف دەکرێت _ بەگشتی ناوی تەشەییوع بەسەر ئەوکەسانەدا دەدرێ کە ڕێزی عەلی دەدەن بە سەر ئەبوبەکرو عمردا، لە بەر پێچەوانەی ئەوەی کە هاتوە لە عەلیەوە لەم بارەیەوە، تەشەییوع بەواتای سەرخستن و شوێنکەوتن دێت نە پێچەوانەو دژایەتی کردن[٦]، ئیبن بطة لە شێخەکەی مەعروف ئەبو عەباسی کوڕی مەسروقەوە دەڵێ: موحەممەدی کوڕی حەمید دەگێڕێتەوە بۆمان، جەریر دەگێڕێتەوە بۆمان، لە سوفیانەوە، لە

---

[٤] فتاوى ابن تيمية(٣/ ١٥٣)، فتح الباري (٣٤/٧).

[٥] منهاج السنة(٦٠/٢).

[٦] اصوالشيعة الإمامية الإثني عشرية(٦٥/١).

عەبـدوڵڵای کـوڕی زیـادی کـوڕی جـەریرەوە دەڵـێ: ئـەبو ئیسحاقی سەبیعی هاتە کوفەو شەهری کوڕی عطیة پێی وتین:

هەستن با بڕۆین بۆلای، ئێمـەش ڕۆشتین و لای دانیشتین، دەست کرا بە قسەوباس کردن، ئەبو ئیسحاق وتی:

لە کوفە دەرچـوم هـیچ کەسێك نـەبو گومـانی هـەبێت لـە چـاکەی ئەبوبـەکرو عمـرداو پێشخسـتنیان، ئێسـتاش گەڕاومەتەوە کەچی ئەوان دەڵێن، نا سوێند بەخوا نـازانم چـی دەڵێن[7]، مُحبُّ الدين الخطيب دەڵـێ: ئەمـە دەقێکـی مێـژوویی گەورەیە کە گەشـەو سـەرهەڵدانی تەشـەیوع دیـاری دەکـات، چونکە بەڕاستی ئەبو ئیسحاقی سـەبیعی نـاودارو زانـای کوفـە بووە[8]. لە جێنشینی ئەمیری باوەڕداران عوسماندا لە دایك بوەو پێش سێ ساڵ لە شـەهید کردنـی، ژیاوە هـەتاوەکو لـە ١٢٧ك وەفاتی کردوە، لە جێنشینی ئەمیری باوەڕداران عەلیدا

---

[7] المنتقى، ص(٣٦٠).

[8] انظر ترجمة في تهذيب التهذيب(٦٣/٨)الخلاصة، ص(٢٩١).

منداڵ بووە، سەبارەت بەخۆی دەڵێت: باوکم بەرزی کردمەوە هەتاوەکو عەلی کوڕی ئەبو تالیبم دیت وتاری ئەدا، سەرو ڕیش سپی بوبوو، ئەگەر بمان زانیایە کەی لە کوفە دابڕاو پاشان گەڕایەوەو سەردانی کرد، ئەوا دەگەیشتین بە ناسینی ئەو زەمانەی کە شیعەی کوفەی تێدا بوو دەیان بینی ئەوەی کە پێشەواکەیان دەیدیت لە بەهادان‌و قەدری ئەبوبەکرو عمردا، کەی دەستیان کرت بە جیابونەوە لە عەلی‌و پێچەوانە کردنی لەوەی کەوا باوەڕی پێهەبوو ، نەفرەتی لەوکەسە دەکرد لە سەر مینبەری کوفە لە قەدرو بەهادانی بەسەر دوو براکەی، دوو هاوەڵەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ و دوو وەزیرەکەی‌و دوو جێنشینەکەی بەسەر گەلە کەیەوە لە پوخترین‌و خاوێترین کاتیدا[9] ، لیثی کوڕی ئەبو سُلیم دەڵێت: گەشتووم بە شیعەکانی سەرەتا قەدرو بەهای هیچ کەسێکیان نەدەدا بەسەر ئەبوبەکرو عمردا[10] ،خاوەنی مختصر التحفة باسی

[9] حاشیة المنتقى، ص(٣٦٠، ٣٦١).

[10] المنتقى، ص(٣٦٠، ٣٦١).

کـردوەو وتویـەتی: بەڕاسـتی ئەوانـەی کـە لـە سـەردەمی جێنشینی ئەمیردا _ خوالێی ڕازی بێت _ هەبون لە کۆچەرانو یاری دەدەران، ئەوانەشی کە بەچاکی شوێن ئـەوان کـەوتبون، هەموو یان مافو حـەقی ئـەویان زانیبـوو، چاکەی ئـەویان لـە شوێنی خۆیدا دانابوو، بەناتەواویان دانـەنابوو هـیچ کامێـك لـە براکانو هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەبـە بێباوەڕدانـانیو جنێودان پێـی[11]، بـەڵام تەشـەییوع بـەردەوام نـەبون بـە ئـەم پـوختیو بـێ لەکەییـەو سـەلامەتیو شـکۆ مەندیـە، بـەڵکو ئـەنجامو مەبـدەئی تەشـەییوع گـۆڕا، دواجـار شـیعە بـون بـە تاقمێـك، تەشـەییوع بـوو بـە دەمـامکێکو هـەموو یـەکێك کـە بیویسـتایە فێـڵ لـە ئیسـلامو مسـوڵمانان بکـات خـۆی پـێ دادەپۆشت لە دوژمنانی کـین لـە دڵو حەسـود.. هـەر لـە بـەر ئەمەیـە ئـەو کەسـانەی کـە تانـە لـە ئەبوبـەکرو عمـر دەدەن ناومان لێ ناون رافضي، لەبەر ئـەوەی ئـەوان شـیاوی وەصـفی

---

[11] مختصر التحفة الإثني عشرية، ص(٣).

تەشـەییوع نـین[12] ، هـەر کـەس پێکهاتـەی بیروبـاوەڕی شـیعە بناسێ بە لایەوە نامۆنیە بونی کۆمەڵێك لە ناودارانی فـەرمودە ، جگـە لـە زانایـانی فـەرمودەو ناودارانـێ کـە نازنـاوی شـیعە دراوە بە سەریاندا ، لە هەمانکاتدا لە پێشەوایانی سوننەن ، لە بەر ئەوەی بۆ تەشەییوع لە سـەردەمی پێشـینەدا مـەفهومێك‌و پێناسەیەکی تر هەبو جگە لـە مـەفهوم‌و پێناسـەی دوایـین بـۆ شیعە.

هەر لەبەر ئەمەیە زەهەبی لە پێشانگای فەرمودەدا دەڵێت سەبارەت بەوکەسانەی کە بیدعەی تەشەییوع دراوەتە پاڵیان، یان دەڵێت: بیدعە لە سەر دوبەشە، یـەکیان بیدعـەی بچوکە، وەکـو زیـادەڕەوی تەشـەییوع، یـان وەکـو تەشـەییوع بـەبێ زیـادەڕەوی، ئەمـــەش زۆرە لـــەناو تابیعینـــدا، هـــەروەها شوێنکەوتوانیان لە ئـاین‌و خۆپاراسـتن‌و ڕاسـت گـۆیی، ئەگـەر بێتـو فـەرمودەی ئەمانـە قـەبوڵ نـەکرێت ئـەوا زۆرێـك لـە

---

[12] أصول الشيعة الإمامية الإثني عشرية(١/٦٦، ٦٧).

فـــەرمودەکانی پێغەمبـــەر ﷺ لەناودەچـــێت، ئەمـــەش خراپەکارییـــەکی ڕوونـــە، پاشـــان بیدعـــەی گـــەورە وەکـــو ڕەدکردنـــەوەی گشـتیو زیـادەڕەوی تێیـداو کـەم کردنـەوەی قەدری ئەبوبەکرو عمر خوالێیان ڕازی بێـتو بانگێشـە بـۆ ئـەم کارە، ئائەم جۆرە پشتیان پێ نابەسترێتو هیچ ڕێزێکیـان بـۆ نیەو ئائێستا یەك پیاوی ڕاستگۆو متمانە پێکراو لـەم بەشـەدا بەردەســت نابێــت، بــەڵکو درۆ مەشــخەڵیانەو خۆپاراســتنو دووڕوویی بەرنامەیانە، دەیچۆن قەبوڵ دەکرێـت گواسـتنەوەی کەسێك ئەمە حاڵی بێـت، نـەخێرو حاشـا، ئەوشـیعە کـەوا زۆر ڕۆچـوبون لـە سـەر دەمـی پێشـینەداو ئـەوان دەیـان ناسـین ئەوانەبون کەوا قسەیان دەکر سەبارەت بە عوسمانو زوبەیرو تەلحەو موعاویەو کۆمەڵێك لەوکەسانەی لە گەڵ عەلیدا خوالێی ڕازی بێت جەنگانو جنێویان پێ دەدەدان، ڕۆچوان لەم زروفی ئێمەداو ئێمە ناسیومانن ئەوانەن کە ئەو گەورانە کافردەکـەنو بـێ بـەری دەکـەن لـە هـەردوو گەورەکـە ئائەمـە گـومڕاو درۆ

هەڵبەسە [١٣] ، کەواتە شیعە پلەو پێکهاتەو قۆناغە، هەروەکو چۆن بەش بەش‌و گرۆیە، پێش ئەوەی کەوا دەست هەڵگرین لە قسەکردن لە دەوری پێناسەی شیعە ئاماژە بۆئەوە دەکەین کەوا چاو بخەینە سەر ئەو پێناسانەی کە هاتوە سەبارەت بە شیعە لە گەورە کتێبەکاندا، بەڕاستی بەردەوام دەبێت لە سەر وتەکان لە پێناسە بۆشیعەی ئیمامی کەوا ئەوان شوێنکەوتەی عەلین...هتد.

ئەمە دەست گیرۆیی ئەکات بۆ سەرەنجامێکی خراپ‌و پێچەوانەی هاودەنگی هەموو ئوممەت دەکات، ئەم سەرەنجامەش ئەوەدەگەیەنێ کە عەلی شیعەیەو ئەوەی لای شیعە پەسەندە لای ئەویش پەسەندە ، عەلی خوالێی ڕازی بێت بەریە لەوەی کە بیروباوەڕی شیعە هەیانە سەبارەت بەخۆی‌و نەوەکانی، هەر لەبەر ئەمە پێویستە بۆ لادانی

[١٣] میزان الإعتدال للذهبي (١/٥، ٦)، لسان المیزان (١/٩، ١٠).

نـەزانراوەکان دانـانی قەیـدو ڕەخنـەگرتن لـە پێناسـە ، بۆیـە وتراوە: ئەوان ئەو کەسانەن  کە گومانی شوێنکەوتەی عەلی بە خۆیاندەبەن، بەجۆرێك لە ڕاستیدا ئەوان بەڕاستی شوێن عـەلی نەکـەوتوون، هــەروەها ئــەمیری بــاوەڕداران لــە ســەر ئــەو بیروباوەڕەی ئەوان نیە[14] ، یان وتراوە: کەوا ئەوان بانگێشـەی تەشەییوع یان رافضـە بۆ عـەلی دەکـەن ، هـەر لەبـەر ئەمەیـە هەندێك لە ئەهلی عیلم  لێك دانەوەی بۆ ئەوان

کردوەو وتویانە: رافضە کان دراونەتە پاڵ شیعەی عـەلی[15] ، لە هەمانکاتدا ئەوان لـە سـەر ڕێـڕەوی شـوێن کـەوتوانی عـەلی نــین‌و شــوێنی ئــەو نەکــەوتوون، بــەڵکو ئــەوان شــیعەو رافیضـەن[16] .

---

[14] أصول الشيعة الإمامية الإثني عشرية(١/٦٨).

[15] منهاج السنة(٢/١٠٦).

[16] أصول الشيعة الإمامية الإثني عشرية(١/٦٩).

## ٣_ الرفض لە زمانەوانیدا:

بریتیە لە وازهێنان، وتراوە رفضت الشيء: واتە وازم لێ هێنا[١٧]، رفض لە زمانەوانیدا واتاکەی: وازهێنانو دورکەوتنەوەیە لە شتێك.

## ٤_ الرافضە لە زاراوەدا:

بریتیە لە یەکێك لەو گرۆیانەی کە دراوەتە پاڵ ئەو کەسانەی بانگێشە بۆ ئالویەیت دەکەن، لە گەڵ بێ بەری کردنیان لە ئەبوبەکرو عمرو باقی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ جگە لە ژمارەیەکی کەم لەوانو کافرکردنیانو جنێودان پێیان[١٨]، پێشەوا ئەحمەد رحمە الله دەڵێت: رافضە: بریتیە لەو کەسانەی تەبەڕاو بێ بەری دەکەن لە هاوەڵانی موحەممەدی ڕەوانەکراوی خواﷺ و جنێویان پێ دەدەنو لە قەدرو

---

[١٧] القاموس المحیط للفیروز ابادي(٢/٤٢٢).

[١٨] الإنتصاب للصحب والآل، ص(٢٥).

قیمـەتیان کـەم دەکەنـەوە[19]، هـەروەها عەبـدوڵڵای کـوڕی ئەحمەد رحمەالله دەڵێـت: پرسیارم کـرد لـە بـاوکم دەربـارەی رافیضـە؟ ئـەویش وتـی: ئەوکەسـانەن کـە جنێـو دەدەن بـە ئەبوبـەکرو عمـر _ خوالێیـان ڕازی بێـت _[20]، ئـەبو قـاسمی تەیمی ناسراو بە قەوامو سوننە لە پێناسەیاندا دەڵێـت: ئـەوان بریتین لەوکەسانەی کە جنێو دەدەن بە ئەبوبەکرو عمر _ خوا لێیان ڕازی بێت _و ڕەزای خـوا لـە خۆشەویسـتانیان بێـت[21]، بەڕاستی رافضە خۆیان بە جیاکرتووە لە نێوان ئەو گرۆیانـەی کە دراونەتە پاڵ ئیسلام بە قسەی نـاقۆڵا بەهـەردوو گەورەکـە ئەبوبـەکرو عمـر، جگـە لـەوان لـە گرۆکـانی تـر، ئەمـەش لـە گەورەیی سـەر شـۆڕییانە بـەر نـەفرەتی خـوا بکـەون[22]، ئـیبن تەیمیە رحمەالله دەڵێـت: رافضـە ڕقیانـە لـە ئەبوبـەکرو عمـرو

[19] طبقات الحنابلة لابن أبي يعلى (٣٣/١).

[20] السنة للخلال رقم: (٧٧٧)، وقال المحقق:إسناده اصحيح.

[21] الحجة في بيان المحجة (٤٧٨/٢).

[22] الإنتصاب للصحب والآل، ص(٢٦).

نـەفرەت لـەوان و لـە تائیفـەکانی تـر دەکـەن[٢٣]، لەڕاسـتی لـە کتێبـەکانی رافضـە دا شـتانێك هـاتوە کەئەمـە دەسـەلمێنن و شـایەتی بـۆ دەدەن: ئـەوان دایـان نـاوە خۆشەویسـتی دوو گەورەکەو دۆستایەتیان لـە نـەبونیان ئـەوە جیاکەرەوەیـە لـە نێوان ئەوان و نێوان کەسانی تر بێ لـەوان لەوانـەی کـە وشـەی (النواصب)یان داوە بەسەریاندا، بەڕاستی دەڕازی دەگێڕێتەوە لە موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی موساوە دەڵێت: نوسـراوێکم نوسی بۆ عەلی کوڕی موحەممەد علیه السـلام[٢٤] سـەبارەت بـە الناصب ئایا پێویست ئەکات لـە تاقیکردنەوەیدا بـە زیـاتر لـە پـێش خسـتنی (الجبـت _ أبـوبکر، والطـاغوت _ عمـر)[٢٥] و

---

[٢٣] مجموع الفتاوی (٤٣٥/٤).

[٢٤] ئەو یەکێکە لە پێشەوایانی الإثني عشرية عند الإمامية، وفيات الأعيان(٢٧٢/٣).

[٢٥] مەبەستیان لەو ناوە: ئەبوبەکرو عمرە خوالێیان ڕازیبێت هەروەکو هاتوە لە تەفسیری العیاشی دا(٢٤٦/١) ئەو تەفسیرە لە گرنگترینی کتێبەکانی تەفسیرە لەلایان، لە لای لەرمایشتی خوای بلند مەقام: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّـٰغُوتِ ﴾ النساء: ٥١.

بیروباوەڕ بە پێشەوایەتیان؟ وەلامەکەی بۆ گەڕایەوە: هەر کەس لە سەر ئەمەبێت ئەوا ئەوکەسە ناصبەیە[٢٦].

٥_ هۆی ناو نانیان بە رافضە:

زۆرینەی لێکۆڵەران وادەبینن کە هۆی دانانی ئەم ناوە بەسەر رافضەدا، لەبەر واز هێنانو دورکەوتنەوەیانو بڵاوە لێکردنیان بوو لە زەیدی کوڕی عەلی لە دوای ئەوەی کەوا ئەوان بە شێکبون لەسوپاکەی، کاتی دەرچونی بۆ سەر هیشامی کوڕی عەبدوڵلای پاشا، لە ساڵی سەدو بیستو یەك (١٢١)دا ئەمەش لە دوای ئەوەی کەوا تەبەڕای خۆیانیان لە دوو گەورە پیاوەکە _ ئەبوبەکرو عمر_ بەدەرخستو ئەویش ڕێگری کردن لەم کارە ، ئەبو حەسەنی ئەشعەری دەڵێت: زەیدی کوڕی عەلی ڕێزی عەلی کوڕی ئەبو تالیبی دەدا بەسەر هەموو هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا ﷺ و پشتیوانی خۆی بۆ ئەبوبەکرو عمر دەردەبڕی، وای بەباش زانی کەوا دەربچێت

---

[٢٦] المحاسن النفسانية لمحمد آل عصفور الدرازي، ص(١٤٥).

بۆسەر پێشەوا ستەم کارەکان، کاتێ کەوا دەرکەوت لە کوفە لە ناو ئەو هاوەڵانەیدا کەوا بەیعەتیان پێدابوو لە هەندێکیانی بیست کەوا تانە لە ئەبوبەکرو عمر دەدەن، بۆیە ئەویش نکوڵی لەم کارەکرد لە سەر ئەوکەسانەی کە لێی بیستن، ئەوانەی کەوا بەیعەتیان پێدابو لەبەر ئەمکارەی بڵاوەیان لێکرد، ئەویش پێی وتن: رفضتموني_ دوور دەکەونەوەلێم؟. بۆیە دەڵێن ئەوان ناویان لێنرا: رافضە لەبەر قسەی زەید کە پێی وتن رفضتموني [27]، قوام السنه [28] و الرازی [29] و الشهرستانی [30] و ابن تیمیة [31] ئەم قسەیان کردوەو بەم شێوە باسیان کردوە _ رحمهم الله _ ئەشعەریەکان بۆ چونێکی تریان هەیەو وتویانە: بۆیە ئەوان ناونراون رافضە لە بەر

---

[27] مقالات الإسلاميين (٣٧/١).

[28] الحجة في بيان المحجة (٤٧٨/٢).

[29] اعتقادات فرق المسلمين والمشركين، ص(٥٢).

[30] (٤)الملل والنحل (١٥٥/١).

[31] منهاج السنة (٨/١) مجموع الفتوى (٣٦/١٣).

قەبوڵ نەكردنو ڕەتكردنەوەی ئیمامەتی دوو گەورە پیاوەكە بووە، ئەبوبەكرو عمر[32] .

٦_ رافضەی ئەمڕۆ:

رافضەی ئەمڕۆ زۆر ڕقیان لـەم نـاوە دەبێتـەوەو پێـی ڕازی نین، وادەبینن كەوا ئـەم نـاوە یەكێكـە لـەو ناووناتۆرانـەی كـە ئەوكەسانەی پێچەوانەی ئـەوانن داویانەتـە پاڵیـان، مۆحسـینو لئەمین دەڵێت: رافضـە لەقەبێكـە بەواوەیـەوە جیادەكرێتـەوە ئـەو كەسـەی عـەلی خـوالێی ڕازی بێـت پـێش دەخـات لـە خیلافەتـداو زۆر بـەكاری دێنێـت بـۆ چـاك بونـەوەو تۆڵـە سەندن[33] ، هەر لەبەر ئەمەیە ئەمڕۆ ناوی خۆیـان نـاوە شـیعەو بەم ناوە ئاشنا بوون لای زۆرینـەی خـەڵكیو لـە ڕاسـتیدا ئـەم كارەیـان كـاری گـەری بـوە لەسـەر هەنـدێك لـە كتێبـەكانو ڕۆشنبیران، بۆیە دەبینین كەوا ئـەم نـاوە دەدەن بەسـەریاندا،

---

[32] مقالات الإسلاميين (٨٩/١).

[33] أعيان الشيعة (٢٠/١).

لەڕاستیدا شیعە زاراوەیەکی گشت گیرەو هەموو کەسێك لە شوێنکەوتوانی عەلی خوالێی ڕازی بێت لە خۆ ئەگرێت[٣٤]، بەڕاستی هاوەڵانی دەستەی مەقالات باسیان کردوە کەوائەوان سێ پۆلن:

أ_ غالیة: ئەوانە ئەوکەسانەن کە زیادەڕەویان کردوە لە حەقی عەلیداو بانگێشەی خواوەندی یان پێغەمبەرایەتیان بۆ کردوە.

ب_ رافضة: ئەوانە ئەوکەسانەن کەوا بانگێشەی بەڵگە بوون دەکەن لەسەر جێنشینی عەلیو تەبەڕاو بێ بەری دەکەن لە خەلیفەکانی پێشیو زۆرینەی هاوەڵان.

جـ_ زیدیة: ئەمانە شوێنکەوتوانی زەیدی کوڕی عەلین، ئەوکەسانەن کە قەدرو چاکەی عەلی دەدەن بەسەر تەواوی هاوەڵانداو دۆستایەتیو پشتیوانی ئەبوبەکرو عمر

---

[٣٤] مقالات الإسلاميين (٦٥/١). الملل والنحل للشهرستاني (١٤٤/١).

دەردەبڕن[35] ، بۆیە دانی ناوی شیعە بەسەر رافضەدا بەبێ جیاکردنەوەو بەستنەوە بۆ ئەم زاراوەیە دروست نیە، لە بەر ئەوەی ئەم زاراوەیە زەیدیەکانیش دەچنە ناویەوە[36] ، لە حالێکدا ئەوان دۆستایەتی ئەبوبەکرو عمر خوالێیان ڕازی بێت دەکەن‌و پشتیوانی خۆیان بۆ ئەوان پیشان دەدەن، بەڵکو بەڕاستی ناونانیان بە شیعە وەهمی تێکەڵ بوونیان دەکات بە شیعەی پێشووەوە، ئەوانەی کە لە سەردەمی عەلیدا بوون خوا لێی ڕازی بێت‌و ئەوانەشی لە دوای ئەوانەوە هاتن جا بەڕاستی ئەوانە هەرهەموویان کۆك‌و کۆبوون لە سەر قەدرو بەهادانی ئەبوبەکرو عمر بەسەر عەلیدا خوالێیان ڕازی بێت ئەوان تەنها ئەوەنەبێ کە چاکەی عەلیان دەدا بەسەر عوسماندا‌و لەناو ئەواندا زۆرێك لەپیاوچاکان‌و زانست خوازانیان تێدابووە، ئیبن تەیمیە رەحمەتی خوای لێبێت دەڵێ: هەر لەبەر ئەمەیە کە شیعەی پێشو ئەوانەی

---

[35] مقالات الإسلاميين (١/٦٦، ٨٨، ٣٧). الملل والنحل (١/٢٥).

[36] الإنتصار للصحب والآل، ص (٢٩).

هاوەڵایەتی عەلیان کردبوو، یان ئەوانەی لە سەردەمی ئەودا بوون هیچ ناکۆکیەکیان نەبوو لەسەر قەدرو بەهادانی ئەبوبەکرو عمردا بەسەر هەموو هاوەڵاندا، نەوەکو ئەوان ناکۆکیان هەبو تەنها لە بەهادانی عەلیدا بوو بە سەر عوسماندا[37]، لەبەر ئەمەیە کە ناونانی ((الرافضة)) بە شیعە لەو هەڵە ڕوونو ئاشکرانەیە کە هەندێك لە کەسانی ئەم سەردەمە تێی کەوتوونو شوێن پێ هەڵگرتنی رافضتیە لە کۆششو ڕزگار بوون لەم ناوە کاتێ کە بینیان پێشینەی چاك زۆر زەمو سەرزەنشتیان دەکەنو لێیان تورەن، بۆیە ویستیان ڕزگاربن لەم ناوەو لەو کەسانەی کەوا نایان ناسنو شارەزایان نین بەگشتی ناوی شیعە بدەن بەسەر خۆیاندا، هەندێك لە شوێنەواری ئەمە ئەوەیە کەهەندێك لە خوێنکارانی سەراتایی تێی کەوتوون، لەوانەی کە ڕاستی ئەم زاراوەیە نازانن لە هەڵەیەکی گەورە لە نێوان حوکمەکانی رافضەو حوکمەکانی شیعەدا، کاتێ کەوا جێگیربو لایان دانانی زاراوەی تەشەییوع

---

[37] منهاج السنة (١/ ١٣).

بەسەر رافضەدا، بۆیە واگومانیان دەبرد کەوا ئەوەی هاتوە لە وتەی زانایانی پێشودا سەبارەت بە مافی شیعە هەمان مافیش دەدرێتە پاڵ رافضةو خۆیانی پێ دادەپۆشن، لە کاتێکدا کە زانایان لە تەواوی حوکمەکاندا جیاوازیان کردوە لە نێوانیاندا [٣٨]، لە سەریەتی چونکە بەڕاستی واجبە کەوا ئەوانە ناو ببردرێن بە روافض بە ناوە ڕاستەکەی خۆیان ئەو ناوەی کەوا زانایان دایان ناوەو کردویانە بەزاراوە بۆیان‌و نەدانی ناوی شیعە پێیان لە سەر ڕوی گشتی، لەبەر ئەو گۆڕان‌و نادیاریەی کەتێیدایەتی، کاتێ کەوا زاراوەی ((الشیعة)) درا بەسەریاندا ئەوا پێویستە ببەسترێتەوە بەو شتەی کە بەتایبەت ئاماژە دەکات بۆیان، وەکو ئەوەی بوترێ ((الشیعة الإمامیة)) شیعەی ئیمامی یان ((الشیعة الإثني عشریة)) شیعەی دوانزە ئیمامی لە سەر ئەو نەریتەی کە زانایان لە سەری رۆشتون لە کاتی باس کردنیاندا [٣٩] والله تعالی أعلم.

---

[٣٨] الإنتصار للصحب والآل، ص (٣٠).

[٣٩] الإنتصار للصحب والآل، ص (٣٢).

## دووەم: سەرهەڵدانی شیعەی رافضیو باسی کاریگەری جولەکە لە سەرهەڵدانیاندا:

یەکەم کەس کە بانگێشەی کرد بۆ بنەماکانی بیروباوەڕی شیعەی رافضیو ئەوبنەمایانەی کە بیروباوەڕەکانی تریان بنیاد نرا لەسەری: پیاوێکی جولەکەبوو ناوی عەبدوڵلای کوڕی سەبە بوو لە جولەکەکانی یەمەن بوو، لە سەردەمی خەلیفەی ڕاشید عوسمانی کوڕی عەفاندا خوا لێی ڕازی بێت مسوڵمان بووو دەستی کرد بەگەڕان لە نێوان شارەکانی مسوڵمانانا بۆ بانگێشەی ئەم بیروباوەڕە پیسو چەپەڵە، ئائەمەش ئەو دەقەیە کە پێشەوا طبري باسی کردوە لە مێژووەکەیداو دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی سەبە جولەکەیەو لە دانیشتوانی خەڵکی صەنعایە، دایکی سەودائەو لە سەردەمی عوسماندا مسوڵمان بووە، پاشان دەگەڕا بەناو شارەکانی مسوڵماناندا هەوڵی گومڕاکردنی دەدانو سەرەتا لە حیجازەوە دەستی پێکرد، پاشان بەصرە، پاشان کوفە، پاشان شام، بەڵام لە شامدا توانای بەدەست هێنانی هیچ کەسێکی نەبوو بۆ ئەوەی

بیروباوەڕەکەی پێ قەبوڵ بکات، بۆیە هەستان بەدەرکردنی هەتا گەشتە میصرو لەوێ لەناویاندا ژیاو پێی وتن و بۆی باس کردن، لەوانەی کەدەیوت: سەیرە کەسێك گومانی وایە کەعیسا دەگەڕێتەوە، کەچی بەدرۆی دەزانێ کە موحەممەد بگەڕێتەوە، لە هەمان کاتدا کەوا خوای بڵند مەقام فەرمویەتی:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ﴾
القصص: ٨٥ .

واتە: بە دڵنیاییەوە ئەوکەسەی کە قورئانی لە سەر تۆ پێویست کردوە دەتگێڕێتەوە بۆ مەککە.ئەمە مانای دروستی ئایەتەکەیە/ وەرگێڕ. دەی موحەممەد لە پێشترە بگەڕێتەوە تا عیسا، دەڵێ: ئەمەیان لێ وەرگرت، گەڕانەوەی پێغەمبەر موحەمەدی بۆ دانان ئەوانیش دەستیان کرد بە قسەوباس تیایدا، پاشان لەدوای ئەمە پێی وتن: بەڕاستی هەزار پێغەمبەر هەبووەو بۆ هەموو پێغەمبەرێکیش ڕاسپاردەیەك هەبوە، عەلیش ڕاسپاردەی موحەممەدە، پاشان وتی

موحەممەد مۆری کۆتایی پێغەمبەرایەتیە، عەلیش مۆری کۆتایی ڕاسپاردەکانە، پاشان لە دوای ئەمە پێی وتن: (( کێ هەیە لەوکەسە ستەمکارتر کە وەصیەتی پێغەمبەری خوا ﷺ جێبەجێ نەکات، هێرش بکاتە سەر ڕاسپاردەی پێغەمبەری خوا ﷺ و کاروباری ئوممەت بگرێتە دەست؟)) پاشان لە دوای ئەمە پێی وتن: (( بەڕاستی عوسمان بە ناڕەوا جێنشینی وەرگرتوە، ئەمەش ڕاسپاردەی پێغەمبەری خوایە ﷺ دەی ڕاپەڕن سەبارەت بەم کارەو بیجولێنن،

سەرەتا تانە لە پێشەواکانتان بدەن، بانگێشەی فرمان بەچاکەو بەرگری لە خراپە بکەن، سەرنجی خەڵکی ڕاکێشن‌و بانگیان بکەن بۆ ئەم کارە)). بانگەوازکارەکانی بڵاو کردەوە، نوسراوی دەگۆڕایەوە لەگەڵ ئەو کەسانەی کەوا لە شارەکاندا گەندەڵ بووبوون، بەنهێنی بانگی دەکردن بۆ ئەو بۆچونەی کەوا لەسەری بون[٤٠]، ئابەم شێوەیە بوو سەرەتای رافضە،

---

[٤٠] تاريخ الطبري (٥/ ٣٤٧).

بــەردەوام ئــەو بیروبــاوەڕەی کــە عەبــدوڵڵای کــوڕی ســـەبە بانگێشەی بۆ دەکرد گوزەری دەکرد بە دەرونی خـەڵکانێك لـە دەسـتەی دڵ نـەخۆش‌و گومڕاکانـداو دڵـەکانیان‌و عـەقڵکانیان دەیـان خـواردەوە تـاوەکو لـە بـەروبومی کوشـتنی خەلیفـەی ڕاشید خاوەنی دوو نورەکە عوسمـانی کـوڕی عـەفانی خـوالێی ڕازی بێـت لێکەوتـەوە لەسـەر دەسـتی ئـەم تاقمـە گەنـدەڵ‌و خراپەکارە، تـاوەکو سـەردەمی عـەلی کـوڕی ئـەبو تالـب هـات دەسـتی پێکـرد ئـەو بیروبـاوەڕەو بەدەرکـەوت زیـاتر لـەوەی پێشوو تاگەشتە عەلی خوا لێی ڕازی بێت ئەویش نـاڕازی بـونی خۆی دەر بـڕی بەتونـدترین شـێوە، نـەك هـەرناڕەزایی بـەڵکو خۆی لـەوو لـە شـوێنکەوتوانی بێبـەری کـردو وتـی مـن بـەریم لێیان، لەوانەی کە بەدروستی هاتوە لـە عـەلێوە خـوالێی ڕازی بێـت ئەوەیـە کـە ئیبنـو عەسـاکیر دەگێڕێتـەوە لـە عـەماری دوهنیـەوە دەڵێـت: بیسـتم ئـەبو توفـەیل دەیـوت: مسـەییەبی کوڕی لوجبەم دیت کە ملببـەی مەبەسـت _ کـوڕی سـەودائە_ هێناو عەلی لە سەر مینبەر بو عـەلی وتـی: حـاڵی ئـەوە چۆنە؟

ئەویش وتی: درۆ بەسەر خواو پێغەمبەرەکەیەوە دەکات[41]، لە زەیدی کوڕی وەهبەوە لە عەلیەوە دەڵێت: چ پەیوەندیەك هەیە لە نێوان منو ئەو زلەی ڕەشەدا[42]، دیسان هەر لە ڕێی زەیدی کوڕی وەهبەوە لە سەلەمەوە لە شەعبیەوە عەلی کوڕی ئەبو تالیب وتویەتی: چ پەیوەندیەك هەیە لە نێوان منو ئەو زلەی ڕەشەدا _ مەبەست عەبدوڵلای کوڕی سەبەئە_ ئەو بێ ئەدەبی کردوە بەرامبەر ئەبوبەکرو عمر[43]، ئەم ڕیوایاتانە جێگیرن لە عەلیەوە خوا لێی ڕازی بێت بە پاڵشتیەکی صەحیحەوە[44]، مێژوو نوسانو هاوەڵانی گرۆو مەقالات باسیان کردوە: کوڕی سەبە بانگێشەی دەکردو دەیوت عەلی خوالێی ڕازی بێت خوایەو پەروەردگارە _ عەلیش لەبەر ئەم کارەی خۆیو هاوەڵەکانی بەئاگر سوتاند[45]، جورجانی دەڵێت:

---

[41] تاريخ دمشق، الإنتصار للصحب والآل، ص (٣٥).

[42] فتح الباري (٧/ ٢٦٨).

[43] هەمان سەر چاوە.

[44] عبدالله بن سبأ للعودة، ص (٩٨)، الأسانيد حكم عليها الألباني.

[45] الإنتصار للصحب والآل، ص (٣٦).

سەبەئیەکان لەرافضەکان دەدرانە پاڵ عەبدوڵلای کوڕی سـەبە و ئەوان یەکەم کەس بوون لە رافضـەکـان کـە بێبـاوەڕ بـوون، دەیوت: عەلی (رب العالمین) پەروەردگاری جیهانیانـە، عـەلیش لەبەر ئەمە خۆیو هاوڕێکانی بە ئـاگر سـوتاند [٤٦]، المطلـي لـە قسەکانیدا سـەبارەت بـە سـەبەئیە دەڵێـت: ئـەوان هاوڕێیـانی عەبدوڵلای کوڕی سەبەئن. بە عەلیان خوالێی ڕازی بێت دەوت: تـۆ. وتـی: مـن چـی؟ دەیـان وت: دروسـت کـەرو بەدیهێنـەری ئەویش داوای تەوبە کردنو پەشیمان بونەوەی لێکـردن، بـەڵام ئەوان لە قسـەی خۆیـان پـاش گـەز نەبونـەوە، بۆیـە ئـاگرێکی بەتینی بۆ هەڵکردنو هەموویانی سوتاندو بەهۆنراوە دەیوت:

کاتێ کەدیتم کارەکە کارێکی منکەرە

ئاری خۆم هەڵکردو بانگم کرد قەنبەرە [٤٧]

هەندێك لە مێژوونوسان بۆ چونیان وایە کەوا عەلی خوا لێی ڕازی بێت ئیبنو سەبەئی نەسـوتاندوە بـەڵکو دووری خسـتەوە

---

[٤٦] التعریفات، ص (١٠٣).

[٤٧] التنبیه علی أهل الأهواء والبدع، ص (٨).

بەرەو مەدائین. پاشان لە دوای مردنی عەلی خوالێی ڕازی بێت بانگێشەی ئەوەی دەکرد کە عەلی نەمردوە، بەوکەسانەی دەوت کەوا باسی مردنیان دەکرد: ئەگەر دەماغیمان لە حەفتا بوخچەدا بۆ بێنن ئێمە مردنی بەڕاست نازانین[٤٨]، بەڵکو زیاتر وادەردەکەوێ وتەی یەکەم ڕاست بێ چونکە ئەوەی کە لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە شایەتی بۆ دەدات، لەعکریمەوە دەڵێ: هەندێك لە زەندیقەکانیان هێنا بۆ لای عەلی خوا لێی ڕازی بێت ئەویش هەموویانی سوتاند هەواڵەکە گەشت بە ئیبنو عەباس ئەویش وتی: ئەگەر من بوومایە نەم دەسوتاندن لەبەر بەرگری کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ: (( لاتعذبوا بعذاب الله، سزامەدەن بە سزای خوا))، بەڵکو دەمکوشتن لەبەر فەرمودەی پێغەمبەری خوا ﷺ ((من بدل دينه فقتلوه[٤٩]، هەرکەس ئاینەکەی خۆیی گۆڕا بیکوژن))، ئیبنو حەجەر لە شیکردنەوەی فەرمودەکەدا لەدوای ئەوەی کە باسکراوە

[٤٨] الفصل لابن الحزم (٥/٣٦)، التبصير في الدين للإسفراييني.

[٤٩] البخاري، كتاب استتابة المرتدين رقم:(٦٩٢٢) .

هەندێك گێڕانەوە سەبارەت بەوکۆمەڵە سوتێنراوە کەتێیاندایە: ئەوانە کەسانێك بون کە بتیان دەپەرست، لەهەندێکیشیانا ئەوانە کەسانێك بوون کە لە ئیسلام هەڵگەڕابوونەوە، لەسەر ئەو جیاوازیەی هەبو لە نێوان گێڕانەوەکاندا لە دیاری کردنیان لەدوای ئەمە دەڵێت: ئەبو موزەففەری ئیسفرایینی واگومان دەبات لە ((الملل والنحل))دا ئەوانەی کە عەلی سوتاندنی کۆمەڵێك بون لە رافضە ئەوان باسی خواوەندیان دەکرد سەبارەت بە عەلیو لەبەرەی سەبەئیەکانبون، گەورەکەیان عەبدوڵلای کوڕی سەبەئی جولەکەبو کە ئیسلام بونی خۆی ئاشکرا کردبو، ئەم قسانەی داهێنا، ئائەمە ئیمکانی ئەوەی هەیە کە ئەصڵ وابێ: لەوەی کە گێڕاومانەتەوە... لە حەدیسی ئەبو تاهیری مخلص لە عەبدوڵلای کوڕی شورەیکی عامریەوە دەڵێت: وترا بە عەلی ئالێرانا لەدەم دەرگای مزگەوتدا قەومێك هەن بانگێشەی ئەوە دەکەن کەوا تۆ پەروەردگاری ئەوانی، ئەویش بانگی کردن: هاوار بۆئێوە چی دەڵێن؟ وتیان: تۆ پەروەردگارو دروستکارو ڕۆزی دەری

ئێمەی[50]، پاشان باقی ڕیوایەتەکان ڕۆشتون‌و تیایاندایە کەوا عەلی خوالێی ڕازی بێت سێ ڕۆژ مۆڵەتی دان‌و داوای پەشیمان بونەوەی لێکردن، بەڵام ئەوان لە قسەی خۆیان پاشگەز نەبونەوە، بۆیە لەناوچاڵانێکدا کە بۆی هەڵکەندبوون بە ئاگر سوتاندنی‌و دەیوت:

لما رأيت الأمر أمراً منكراً　　　أججت ناري ودعوت قنبرا

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەمە سەنەدێکی حەسەنە[51]، مەبەست لێرانا سەرهەڵدانی بیروباوڕی شیعەی رافضەیەی رۆچوو زیادەڕەو لە عەلیدا خوا لێی ڕازی بێت لەو زەمەنە کورتەداو تەماشاکردنی عەلی خوالێی ڕازی بێت لە کاتی سزادانیاندا، تاوەکو ئیبنو عەباس وتی ئەوەی کەوتی، هەروەکو سابت بووە نکوڵی کردنی عەلی بۆهەموو بیروباوەڕێکی تر کە سەری هەڵداوە لە سەردەمی ئەودا،

[50] فتح الباري (١٢/٢٧٠).

[51] هەمان سەرچاوە.

ڕێکخرا لە گرتنەبەری لایەنگرانیدا _ وەکو ڕێزدانی بەسەر تەواوی هاوەڵانداو پێش خستنی لە هەردوو گەورەپیاوەکە، هەروەها بڵاوبونەوەی جنێودانو ڕەخنە گرتن لێیان لە نێوان ئەو کۆمەڵە کومڕایەدا، ئیبن تەیمیە دەڵێت: کاتێ کەوا بیدعەی شیعە پەیدا بوو لە سەردەمی ئەمیری باوەڕداراندا عەلی کوڕی ئەبو تالیب خوا لێی ڕازی بێت ئەو بەرپەرچی دایەوە، سێ تاقم بوون (غالية، سبابة، مفضلة) بەڵام غالیە، ئەوا عەلی ئەوانی بە ئاگر سوتاند، لە ڕاستیدا عەلی ڕۆژێك لە دەروازەی کیندەوە دەرچو کۆمەڵە خەڵکێك سوجدەیان بۆبرد ئەویش وتی: ئەوە چیە؟ وتیان: تۆی الله ئەویش سێ ڕۆژ مۆڵەتی پەشیمان بوونەوەی پێدان بەڵام پەشیمان نەبونەوە، لە ڕۆژی سێیەمدا فرمانی بە خەندەق لێدان کردو بەئاگر پڕیکردنو هەموویانی تێ فڕێدا... بەڵام سەبابە: کاتێ گەشتە ئەوەی کە جنێو بە ئەبوبەکرو عمر بدات عەلی داوایی کرد کە بیکوژن، ئەویش هەڵهات لەدەستی بەرەو قرقیسیاو دەربارەی قسەی دەکرد، لەبەر ئەوەی کە عەلی دەسەڵاتی تەواو جێگیر

نەبوبوو کاربەدەستەکانی سەرپێچیان دەکردو گوێڕایەڵییان نەدەکرد لەهەموو ئەو فرمانانەی کە دەیدا بەسەریاندان، بەڵام مفضلە: عەلی دەیوت هیچ کەسێك نایەنن بۆلام کەمنی بەرز کردبێتەوە بەسەر ئەبوبەکرو عمردا مەگەگەر داری بوختان کەری لێبدەم: دەڵێ لەعەلیەوە گێردراوەتەوە لە هەشتا ڕووەوە کەوا ئەو وتویەتی: چاکترینی ئەم گەلە لە دوای پێغەمبەرەکەی ئەبوبەکرو عمرە [٥٢]، بەهەر حاڵ بیروباوەڕی رافضە لەگەڵ سەر هەڵدانیدا لە سەردەمی عەلیدا خوا لێی ڕازی بێت ئەوان لە چەنکەسێکی کەم پێکهاتبون و زیادیان نەدەکرد تابن بە دەستەو تاقمێك، هەتاوەکو سەردەمی عەلی خوالێی ڕازی بێت تەواو بوو ئەوان هەر بەو شێوەیە مانەوە، دکتۆر ئەبو سەعیدی هاشمی بیروباوەڕی ئیبنو سەبە و ئەو بیدعانەی کە بانگێشەی بۆکردوە لە ڕیسالەکەیدا داینەوەو دەڵێت: ئیبنو سەبە ڕاستیە نەك خەیاڵ، باسیکردوە لە کتێبەکەیدا ئەو گێڕەرەوانەی کە کاریگەر بوون بە ئیبنو سەبە

---

[٥٢] مجموع الفتاوی (٣٥/١٨٤، ١٨٥).

و گرینگترینی ئەو بیدعانـەی کـە ئیبنـو سـەبە بانگێشـەی بـۆ دەکـردن: القـول بالوصـية، ئـەو یەکـەم کەسـبو کـەوا باسـی وەصیەتی پێغەمبـەری خـوای ﷺ کـرد بـۆ عـەلی، کـەوا ئـەو جێنشینی بوە لەسـەر گەلەکـەی لـە دوای خـۆی بـە دەقـەوە، یەکـەم کەسـبو کـەوا بێبـەری بـونی خـۆی ئاشـکرا کـرد لـە دوژمنانی عەلی بە گومانی خۆی، ئاشکرا کەری پێچـەوانەکانی، بڕیاری کافر بونی بۆدان، یەکەم کەسبوو کەوا باسی خوایەتیو پەروەردگاری عەلی خوالێی ڕازی بێت کرد، ئەو یەکەم کەسبوو کەوا بانگێشەی پێغەمبەرایـەتی دەکـرد لـە دەسـتەی شـیعەی ڕۆچو، ئەو یەکەم کەسبوو کە وتەی گەڕانەوەی عەلی خوا لێـی ڕازی بێـت بۆدونیـا لـەدوای مردنـیو گەڕانـەوەی پێغەمبـەری خـوای ﷺ داهێنـا، یەکـەم کەسـبوو کـە بانگێشـەی ئـەوەی دەکرد کە عـەلی خـوا لێـی ڕازی بێـت دابـة الأرضەو ئـەو ئـەو کەسەیە کـە دروسـتکراوەکانی دروسـت کـردوەو ڕۆزی دابـەش کردوە، سەبەئیەکان دەڵێن: ئـەوان نـامرن، بـەڵکو دەفـڕن لـە دوای مردنیانو ناونراون بە طیارة، هەندێك لەوان _ السبئية _

دەڵێن: روح القدس (جبريل) پێشەوایان دەگوازێتەوە، دەڵێن: (بالتناسخ الأرواح) ڕۆحەکان لە شتێکەوە دەچنە شتێکی تر، سەبەئیەکان دەڵێن: ئێمە ڕینمایی کراوین بۆ سروشێك کە خەڵکی لێی گوم و گومڕان، زانستێك کەوا لەوان شاردراوەتەوە، دەڵێن: عەلی لە هەورایە، هەورە گرمەش دەنگێتی، بروسکیش قامچیەتی، ئائەمە رونترین بیدعەیە کە ئیبنو سەبە و شوێنکەوتوانی بیروباوەڕیان پێیەتی و پێی بوون بە ڕۆچوان[53].

لەڕاستیدا گرۆی شیعەی رافضی، وەکو بۆچون و بیروباوەڕ لەناکاو پەیدا نەبووە، بەڵکو پێکهاتەی ڕێڕەوێکی زەمەنیەو بەچەندین قۆناغدا تێپەڕیوە، بەڵام سەرهەڵدانی بیروباوەڕی شیعەی رافضی و بنچینەی بنچینەکانی لە سەردەستی سەبەئیەکان ئاشکرابوو بە دان پێدانانی ئەو کتێبانەی شیعە کەدەڵێن ئیبنو سەبە یەکەم کەسبوو کە شایەتیدا بە قسەی

[53] الرواة الذين تأثروا بابن سبأ، د. سعدي الهاشمي، ص (١٩،٢٠).

ڕەتکردنـــەوەی پێشـــەوایەتی عـــەلی و عـــەلی ڕاســـپاردەی موحەممـــەدە _ هـــەروەکو باســـکرا _ ئائەمـــە بیروبـــاوەڕێکی خـــاوەن دەقـــە لـــە ســـەر پێشـــەوایەتی عـــەلی، ئـــەوە بنـــەمای شـیعەگەری رافضـیە هـەروەکو شـیخەکانی شـیعەی رافضـی پێیـان وایـە، لەوانـەش ئەوەیە کەلـە کافیـدا هـاتوە لـە ئـەبو حەسەنەوە دەڵێت: ویلایەتو پێشـەوایەتی عـەلی نوسـراوە لـە هـــەموو پـــەڕاوەکانی پێغەمبەرانـــدا، هیچـــکات خـــوای گـــەورە پێغەمبـــەرێکی نـــەناردوە مەگـــەر بـــە پێغەمبەرایـــەتی موحەممـــەد ﷺ و ڕاســـپاردەییەتی عـــەلی علیـــە الســـلام[٥٤]، کتێبـــەکانی شـــیعەی رافضـــی شـــایەتی دەدەن_ هـــەروەکو لەمەودوا بەڕوونی دێت بە مۆڵـەتی خـوای گـەورە _ لـە بـەر ئەوەی ئیبنو سەبە و کۆمەڵەکەی یەکەم کەسبوون کـە تانـەو تەشـــەلیان لـــە ئەبوبـــەکرو عمـــرو عوسمـــانو خزمـــانی پێغەمبـەر ﷺ و نزیکـەکانیو خەلیفـەکانیان دەدا، نیـزیکترین کەس لەو خوا لێیان ڕازی بێتو تانە لـە هاوەڵـەکانی دووایـی،

---

[٥٤] أصول الكافي (٤٣٧/١)، أصول الشيعة الإمامية (٧١/١).

ئائەمـە بيروبـاوەڕی شـيعەی رافضـية دەربـارەی هـاوەڵان، هەروەكو چۆن ئەمە هەيە لـە كتێبـە متمانـە پێكراوەكانيانـدا، هەروەكو چـۆن ئيبنـو سـەبە وتويـەتی عـەلی دەگەڕێتـەوە لـە دوای مردنـی [55]، گەڕانـەوەی عـەلی لـە بنـەماكانی شـيعەی رافضيە هـەروەكو لەمـەودوا دێت بـە مۆڵـەتی خـوای گـەورە، هـەروەكو ئيبنـو سـەبە وتويـەتی تايبـەت مەنـدی عـەلی و ئال وبـەيت بەزانسـتی شـاراوەی تايبـەت، هـەروەكو حەسـەنی كوڕی موحەممـەدی كوڕی حەنـەفی ئامـاژەی پێكـردوە [56] لـە ڕيسـالەی الإرجـاءدا [57]، ئائـەم باسـە بـووە بـە بنەمايـەكی بيروباوەڕی لای شيعە، سابت بـووە لـە صـەحيحی بوخاريـدا شـتێك كـە بەلگـەدەكات لەسـەر ئـەوەی ئـەم بيروبـاوەڕە بەدەردەكەوێت لە كاتێكی نزيكدا، بەڕاستی عەلی خوالێی ڕازی بێت دەربارەی پرسياری لێ كراوە، پێی وترا: ئايا شتێك هەيە

---

[55] المقالات والفرق للقمي، ص (٢١)؛ فرق الشيعة للنوبختي، ص (٢٣)، أصول الشيعة الإمامية (٩٦/١).

[56] تهذيب التهذيب (٣٢/٢).

[57] رسالة الإرجاء ضمن كتاب الإيمان لمحمد العدني، ص(٢٥٠ _ ٢٩٤).

لای ئێوە کەوا ئەوشتە لەقورئان و لای خەڵکی بونی نەبێت؟ ئەویش بەتەواوی ئەمەی ڕەدکردوەتەوە[٥٨]، ئائەمە لە گرنگترینی ئەو بنەمایانەیە کە شیعەی رافضی ئایینداری پێوەدەکەن[٥٩]، بەردەست دەکەوێ لە دوای کوشتنی عوسمان خوا لێی ڕازی بێت و سەردەمی عەلی خوالێی ڕازی بێت کە جێگەی خۆی نەگرتبو لە سینەی تاقمێکی دیاریکراوی ناسراودا، بەڵکو لە ڕاستیدا سەبەئیەکان دورنەبو بە درێژ کردنەوەی سەری هەتاوەکو جەنگی عەلیان خوا لێی ڕازی بێت پێ کرد هەروەکو لەمەو پێش لەگەڵمان تێپەڕی، بەڵام ئەوەندەی نەبرد ئەم ڕووداوانە ئامادەی کرد دۆخێکی گونجاو بۆ ئاشکرا کردنی ئەم بیروباوەڕانە، خۆی پیشاندا لە دەستەیەکدا وەکو جەنگی صفین و ڕووداوی تەحکیم کە بەدوایاندا هات کوشتنی عەلی و کوشتنی حەسەن، هەموو ئەم ڕووداوانە پاڵی دەنا بەدڵەکان و سۆزەکانەوە بۆ بانگێشەکردن

---

[٥٨] البخاري، كتاب العلم مع الفتح (٢٠٤/١).

[٥٩] اصول الشيعة الإمامية الإثني عشرية ، (٩٧/١).

بۆ لای ئالوبەیت، ئینجا ڕێڕەوی گرت بۆچونی نوێنەر لە کلاوڕۆچنەی بانگێشەکردن بۆ عەلیو ئالوبەیتی، تەشەییوع بو بە هۆکارێك بۆ هەموو ئەوانەی ڕوخاندنی ئیسلامیان دەویست لە مولحیدەکانو دووڕووەکانو ملهوڕەکان، تێکەڵ بە مسوڵمانان بوو بیرو باوەڕانێکی بێگانە کە خۆی پۆشیبو بە پۆشاکی تەشەییوعو ئاسانبو چونە ژورەوەی لە ژێر پەردەی تەشەییوعدا، بە درێژرایی ڕۆژگار بیدعە فراوان بووو مەترسی زۆر گەورە بوو، بەجۆرێك چەندین چێنشین بۆ ئیبنو سەبە پەیدا بوون، بەکارهێنانی نازناوی شیعە لە سەردەمی عەلیدا خوا لێی ڕازی بێت نەبو مەگەر بەواتای دۆستایەتیو سەرخستنەوە، مەبەست نەبوو بە باودانی باوەڕ لە بیروباوەڕێك لە بیروباوەڕەکانی شیعەی رافضی ئەمڕۆ[٦٠]، بەڕاستی بانگێشە کردن بۆ ئالوبەیتو خۆشویستنیان کارێکی ئاساییە، ئەوە خۆشەویستیەکە جیاوازی ناکات لە نێوان ئالداو

---

[٦٠] اصول الشيعة الإمامية الإثني عشرية ، (١/٩٨).

* البداء: بەواتای ئاشکرابوون دێت.

زیادە ڕۆیی ناکرێ تێیاندا، کەم ناکرێتەوە هێچێك لە هـاوەڵان، بەو شێوەی کە دەستەی پاڵدراو بۆ لای تەشـەییوع دەیکـەن، بەڕاستی گەشەی سـەند خۆشـەویتیو زیـادی کـرد بـۆ ئـال لـە دوای ئـەوە نەهامـەتیو دەردەسـەریەی بەسـەریاندا هـات لـە کوشتنی عەلیو پاشان حوسەین...هتد، ئـەم ڕووداوە هەسـتی مسوڵمانانی هەڵقولاند، ئینجا کینە لـە دلان لـەم دەروازەیـەوە هاتنە ژوور، چونکە بۆچونی ئیبنو سەبە دۆخێکی لە باری بـۆ نەبو بۆ ئەوەی گەشە بسێنێتو بـلاو بێتـەوە مەگـەر لـە دوای ئەم ڕووداوانەوە.. بەلام تەشەییوع بە واتای بیروباوەڕ دەقێکە لە سەر عەلی خـوا لێـی ڕازی بێـتو گەڕانـەوەی دوای مردنـیو زانستی (بنا )* دەرکـەوتن بـۆ خـواو پـەنهانیو بـێ گونـاهیو پارێزراوی پێشەواکان لە گوناه...هتد، هیچ گومانیی تێـدا نیـە کـەوا ئـەوە بیروبـاوەڕانێکن خـوای گـەورە هـیچ بەڵگەیـەکی بەهۆیەوە دانەبەزانـدوە، نامۆبـێ لای مسـوڵمانان_ بنـەماکانی دەگەڕێتەوە بۆ چەن بنەچـەیەکی جیـاواز، بۆیـە کـەوا سـواری کەشتی تەشەییوع بووە هەموو یەکێك ویستبێتی فـێڵو پـیلان

بـۆ ئیسـلام‌و شـوێنکەوتوانی دابڕێـژێ، هـەموو یـەکێك کـە چاوبەسی کردبێ بۆ ئەوەی لـە ژێـر سـێبەری بیروباوەڕەکـەی پێشویدا بژی بە ناوی ئیسلامەوە، لـە جولەکـە، لـە گـاور، لـە ئاگر پەرست‌و کەسانی دیکە، زۆرێك لە بیروباوەڕە بـێ کـەڵك‌و فاسیدەکان چونە نـاو تەشـەییوع، هـەروەکو لەمـەودوا ئـەوە ڕوون دەبێتـــەوە لـــە کـــاتی خوێندنـــەوەی بنـــەماکانی بیروباوەڕیان، لەبەر ئەمەیە کە ئیبن تەیمیە رحمه الله بۆچونی وایە کە ئەوکەسانەی خۆیان داوەتە پاڵ تەشـەییوع زۆرێـك لـە بۆچون‌و کاروکردارانی فارس‌و ڕۆم‌و یونـانی‌و گـاورو جولەکـەو کەسانی دیکە جگەلەوان وەرگرتبوو دابویانـە پـاڵ تەشـەییوع، دەڵێـت: ئائەمـە پشـت ڕاسـتکردنەوەیە بـۆ ئـەوەی کـە پێغەمبەرﷺ هەواڵیدابوو، هەندێك لەو فەرمودانەی کەهاتوون لەسەر ئەوە دەڕۆن کـەوا ئـەم گەلـە لەمـەودوا سـواری ئاکـارو ڕەوشـتی گـەلانی پـێش خۆیـان دەبـن‌و لـە سـەری دەڕۆن...،

وتویـەتی کـەوا ئەمـە بـەخودی خـۆی دەچەسـپێت لـە نـاو ئەوکەسانەی خۆیان داوەتە پاڵ تەشەییوع[61] .

بـۆ زیـاتر زانیـاری لـەم بارەیـەوە سـەردانی ژیـان نامەی پێشەوای باوەڕداران عەلی کوڕ ئـەبوتالیب بکـە: (سيرة أمير المؤمنين علي بن أبي طالـب/ الـدكتور علـي محمد الصلابي: ل ٥٦٢_٧٣٠) .

براو خوشکی خوێنەر وەك دان نـان بەچاکەی نوسـەر (د. علی محمد الصلابی)دا دەڵێم هەندێك لەسەرچاوەکان لەنوسراوەکانی ئـەوەوە وەرگیراون، گەرچـی ئاماژەمـان بەهـەنێکیان نـەکردووە، بۆیـە داواکـارم لـەخوای گـەورە ئـەمکارەم بەخیانـەتکاری زانسـتی لەسـەر تۆمارنـەکاتو پاداشـتی دوکتـۆرو نوسەریشـی بداتـەوە بەچـاکترین پاداشت لەدواڕۆژدا.

[61] منهاج السنة (١٤٧/٤)، أصول الشيعة الإمامية (١٠٩/١).

# گرنگترینی

# بیرو باوەڕەکانی شیعەی دوانزە ئیمامی

## ١_ إيمامة: پێشەوایەتی:

شـیعەی رافضـیو دوانزەئیمـام پێیـان وایـە کـەوا باوەڕی هیچ کەسێك دانامـەزرێت تـاوەکو ئیمامـەت بـە گرنگتریـنی بنـەماکانی ئیسـلام دانـەنێت، هەرکەسـێك ئەمە بیروباوەڕی نـەبێت ئـەوا لای دوانـزە ئیمامیـەکان کەسـێکی کـافرەو خـوێنو مـاڵو کەرامـەتی بـۆ ئـەوان حەڵاڵە، ئەمەش لـە گرنگتریـنی کتێبکەنیانـدا هـاتووە،

بۆ نمونە لە کافید[٦٢] ریوایەتانێك هەن کەوا ئیمامەت بە گـەورەترینی روکنـەکانی ئیسـلام ئـەژمار دەکـات، کولەینی[٦٣] بە گێڕانەوەی خۆی لـە ئـەبو جەعفـەرەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئیسلام لەسـەر پێنج پایـە بینـا کراوە: لەسەر نوێژو زەکـاتو رۆژوو حـەجو ئیمامـەت، بـانگ نـەکراوەو داوای پابەنـدبوون نـەکراوە بـۆ هـیچ شتێك بەوجۆرەی کە بانگ کراوە بۆ ئیمامـەت، کەچـی خەڵکی دەستیان گرتووە بەچوارەوەو ئیمامـەتیان واز لێهێنـاوە[٦٤]، براکـانم خوشـکەکانم، وەك مـەعلومی جەنابتانە بینای ئیسلام بە فەرمودەی صەحیح لەسەر

---

[٦٢] کتێبی کافی لای ئەوان صەحیح ترین کتێبی فەرمودەیە، بەوێنەی صەحیحی بخاری لای ئێمەی سوننە مەزهەب.

[٦٣] کولەینی گەورەترینو زاناترینو متمانەترین کەسە لای شیعەکان، بەوێنەی پێشەوا بوخاری رحمه الله.

[٦٤] أصول الكافي (٢/١٨).

پـێج پایـە بینـاکراوە، کـە ئەمانـەن: لـەئیبنو عمـرەوە وتویـەتی پێغەمبـەری خـوا صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فەرمویەتی:((بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَالْحَجِّ وَصَوْمِ رَمَضَانَ)). (رواه البخاري:رقم/٨، ومسلم: رقم ١١٣).واتە: ئیسلام لەسەر پێنج پایـە بینـا کـراوە، یەکەم: شەهادە هێنانـە(أشـهد أن لا إلـه إلا الله وأشـهد أنّ محمدا رسول الله) ئینجا ئەنجامـدانی نوێـژو زەکـات دانو حەجکردنو ڕۆژو گرتن.

بـەڵام شـیعەکان لـەباتی هـەردوو شـایەتیدانەکەدا ئیمامەتیان داناوەو شایەتی دان بە تاکو تەنهایی خواو پێغەمبەرایەتی موحەممەدیان بەمەرجی باوەڕدانەناوە، کـەلای ئـەهلی سـوننە هەرکەسـێك ئـەم پێنجـە بەبنەماکانی ئیسـلام دانـەنێتو بـاوەڕی پێیـان نـەبێت

ئـەوا ئەوكـەس كـافرە، وەئەوكەسـەی كـە شـايەتی بەحـەق نـەداتو نوێـژو زەكـات ئـەنجام نـەداتو جێبـەجێيان نـەكات ئـەوا خـوێنی حەڵاڵـە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمويەتی: فرمانم پێكراوە شەڕ لەگـەڵ خەڵكيـدا بكـەم تـاوەكو شـايەتی دەدەن هـيچ خوايـەكی بەحـەق نيـە جگـە لـە اللهو موحەممـەديش پێغەمبـەری خوايـەو نوێـژ دەكـەنو زەكـات دەدەن كاتێك كە ئەمەيان كرد ئەوا خوێنو ماڵی خۆيـان لـەمن پاراسـتووە مەگـەر بـە حـەقو مـافی ئيسـلامو لێپێچينەوەی كـارە شاراوەكانيشـيان لەسـەر خوايـە. (رواه البخاري: رقم/٢٥، ومسلم:رقم/١٢٦).

وەك زانيتـان شـايەتيدان لای شـيعەكان وەك ئيمامەت گرنگ نيەو هەركەس شايەتيش نەدات بەتاكو تـەنهايی خـواو پێغەمبەرايـەتی موحەممـەد ﷺ مـادام

باوەڕی تەواوی هەبێت بە ئیمامەتی ئیمامەکانیان ئـەوا ئەوکەسـە بـاوەڕدارە، گـەر بەوشـێوەبێ کـەوا ئـەوان دەیلێن ئەوا هەموو هاوەڵان بە ئالو بەیتیشەوە لەگەڵ تەواوی سوننە مەزهەبـەکان کـافرو زنـدیقنو جێگایـان دۆزەخە، چونکە هیچکام لەمانە باوەڕیان وانەبووە کـە ئیمامـەت بنەمایـەك بێـت لـە بەنـەماکانی ئیسـلامو لـە شـەهادەیش پێیـان گـرنتر نـەبووە، گـەر ئیمامـەتیان لاگرنگتر بوایە لە شەهادەت ئەوا حەسەنی کوڕی عـەلی ئیمامـەتی واز لێنـەدەهێنا بـۆ موعاویـەی کـوڕی ئـەبو سوفیان، چونکە واز هێنان لە شتێك نیشـانەی ئەوەیـە کە ئـەو شـتە گـرنگ نیـە، جائەگـەر وابـێ کـەوا ئـەوان دەڵـێن ئیمامــەت گرنترینــی بنــەماکانی ئیســلامەو باوەڕدانامەزرێت مەگەر پابەندبی بەوەۆ ئەوا حەسـەنی کـوڕی عـەلی بەقسـەی ئـەوان کـافرە، هـەروەها عـەلی

کوڕی ئـەبوتالیببیش خـوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت بەهـەمان شـێوە، چـونکە لەپێشـودا ئـەویش وازی لـە پێشەوایەتی هێنا بۆ هەر سێ کەسەکەی پێش خۆی ئەبوبەکرو عمرو عوسمان خـوا لێیـان ڕازی بێـت، نـەك هەر ئەوەندە بەڵکو وەکو سەربازێك فرمانەکانی قەبوڵ دەکردن . پەنا دەگرم بەخوا لەم بیروباوەڕە گەندەڵو بێ بنەمایە.

ئەی ئەوکەسانەی کـەوا عـەلیو نـەوەکانی عـەلیتان خـۆش دەویو خـاوەنی بـیرو هۆشـێکی تـەواون ئێـوە چـۆن ئـەم شـتە قـەبوڵ دەکـەن بـۆ عـەلیو نـەوەکانی عەلی.

# چەن فەرمودەو بۆچونێکی تریان لەم بارەیەوە:

مەجلیسی دەڵێت: هیچ گومانی تێدا نیە کەوا ئیمامەتو باوەڕبون بە ئیمامەتی ئیمامەکان علیهم السلامو گەردن کەچی بۆیان لە دەستەی ئەساسێتیەکانی ئاینەو چاکترە لە تەواوی کردەوەکانی لاشە لەبەر ئەوەی ئیمامەت کلیلی کردەوەکانە(أصول الكافي (١٨/٢)).

موزەفەر کە یەکێکە لە زاناکانی سەردەمیان دەڵێت: ئێمە بیروباوەڕمان وایە کەوا ئیمامەت بنەمایەکە لە بنەماکانی ئاین، باوەڕ تەواو نابێ مەگەر بە بڕوابون پێی، تیایدا دروست نیە لاسایی کردنەوەی

باوباپیران‌و ئـەهل‌و بەخێوکـەران هەرچـەندە گـەورەش بن، بەڵکو چۆن پێویستە تەماشـای یـەکتا پەرسـتی‌و پێغەمبەرایەتی بکرێت‌و بەبێ مینجا مینجا فرمانـەکانی خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ قـەبوڵ بکرێـت، بەهـەمان شـێوە پێویسـتە وا تەماشـای ئیمامـەت‌و فرمانـەکانی بکرێـت، بـەڵکو هەواڵـەکان لەمـە زیـاتر حاسـڵ بـوون لەوکاتەی وتی: پێغەمبەر ئیمامـەتی بـەرز کـردەوە بـۆ عـەلی‌و ئـەو ئیمامـەنی دوای ئـەوو وەسـێتی بـۆ کـردن هەرچـۆنێ وەسـێتی کـرد بـۆ فـەرزکراوو پێویسـت کراوەکـان(عقائـد الإماميـة، ص ١٠٢)، (بحـار الأنـوار: ٦٩/٢٣).

**ئـیبن بابـەوی قـومی** لـە نامیلکەکەیـدا الإعتقـادات **دەڵێـت**: بیروبـاوەڕی ئێمـە سـەبارەت بەوکەسـەی کـە نکوڵی ئیمامەتی پێشەوای باوەڕداران عەلی کوڕی ئـەبو

تالیب علیه السلام دەكات ئەوا ئەو وەكو ئەو كەسە وایە كە نكوڵی لە پێغەمبەرایەتی تەواوی پێغەمبەراندا دەكات، بیروباوەڕی ئێمە سەبارەت بەوكەسەی كەوا دان بە پێشەوای باوەڕداراندا دەنێت بەڵام نكوڵی لە یەكێك لە ئیمامەكانی دوای ئەو دەكات، ئەوا ئەو لە جێگای ئەوكەسەدایە كەوا دانی بە ڕاستی تەواوی پێغەمبەراندا ناوەو نكوڵی لە پێغەمبەرایەتی موحەممەدا ﷺ دەكات. (الإعتقادات، ص ١٠٣)، ثم أبصرت الحقیقة، محمد الخضر، ص ١٢٧).

یوسفی بەحرانی لە مەوسوعەكەیدا _ الحدائق الناظرة في أحكام العترة الطاهرة: ١٥٣/١٨_ دەڵێت: خۆزگە لێم حاڵیبونایە چ جیاوازیەك هەیە لە نێوان ئەوكەسەی كەوا بێباوەڕە بە خوای بەرزو بێهاوتاو پێغەمبەرەكەیو ئەوكەسەی كەبێباوەڕە بە ئیمامەكان

علیهم السلام لە گەڵ سابت بونی بونی ئیمامەتدا لە بنماکانی ئایندا، مەجلیسی دەڵێت: بزانە کەوادانانی وشەی کوفرو شیرك بەسەر ئەوکەسەدا کە باوەڕی نیە بە پێشەوایەتی ئەمیری باوەڕداران و پێشەواکان لە نەوەکانی علیهم السلام و بەهادانیان بەسەر کەسانی جگە لەخۆیان بەڵگە لەسەر ئەوەدەکات کەوا بە ئەبەدی لە ئاگردا دەمێنێتەوە.(بحار الأنوار: ٣٩٠/٢٣).

**ئیبن مطهري حلی دەڵێت:** ئیمامەت بەزەییەکی گشتیەو پێغەمبەرایەتی بەزەییەکی تایبەتە لەبەر ئەوەی دەگونجێ پێغەمبەران لە زەمانێکدا کۆتاییان پێ بێت بە پێچەوانەی ئیمامەتەوە، بۆیە نکوڵی کردن لە بەزەییەی گشتی خراپترە لە نکوڵی کردنی بەزەیی تایبەت. (أصول الشيعة الإمامية: ٨٦٧/٢).

شێخ مفیدیان یەك دەنگیان دەگوێزێتەوە لە سەر ئـەم بۆچـونە لــە کـافرکردنی ئومــەتی ئیســلامو دەڵێــت: ئیمامیەکان یەك دەنگن لەســەر ئـەوەی کەهەرکەسێك نکـوڵی لــە ئیمامــەتی یــەکێك لــە ئیمامــەکان بکـاتو ئینکـاری لـەو گوێڕایـەڵی کردنـەیان بکـات کـە خـوای گـەورە پێویسـتی کـردوە لەسـەری، ئـەوا ئـەو کەسـە کـافرو گومڕایـەو شـایەنی مانـەوەی هـەتا هەتاییـە لـە دۆزەخدا(المسائل للمفید، وقد نقل ذلك عنـه المجلیسـی في البحار:٣٦٦/٨)، ئەم کارە لای شێخەکەیان نیعمـەت الله ی جــەزائیری گەشــتووەتە ئــەو ئاســتەی کــە بانگێشەی جیابونەوەی شیعە بکات لـە مسـوڵمانان بـە بۆنەی باسی ئیمامەتەوەو دەڵێت: ئیمە کۆنابینەوە لـە گەڵ ئەواندا لەسـەر خوایـەكو پێغەمبـەرێكو ئیمامێـك، لەبەر ئەوەی ئەوان دەڵێن: پەروەردگاریان ئـەو زاتەیـە

کـــە موحەمـــەد پێغەمبـــەرێتی ﷺ و خەلیفەکـــەی ئەبوبـەکرە، ئێمـەش وابـەم خوایـەو بـەو پێغەمبـەرە ناڵێین، بـەڵکو دەڵـێین: لـە ڕاستیدا ئـەو خوایـەی کـە خەلیفەی پێغەمبەرەکەی ئەبوبەکرە خـوای ئێمەنیـەو ئـــەو پێغەمبـــەرەش پێغەمبـــەری ئێمـــە نیـــە(الأنـــوار العلمانية: ٢/٢٧٩).وەلامدانەوە بۆ ئەم قسەی نیعمـەت الله ی جـــەزا ئیریـــە، دەخەینـــە کۆتـــا باســـیی ئـــەم نامیلکەوە إنشاء الله تعالى.

جـا پـێم نـاڵێن چ جیاوازیـەك هەیـە لـە نێـوان ئیمامەتو پێغەمبەرایەتیدا، نـەك هـەر ئەوەنـدە بـەڵکو پێیـان وایـە کـە ئیمامـەکان لـە پێغەمبـەران چـاکترن، ئـەوەتا خومـەینی لـە ناوچـوو نـەزان لـە یـەکێك لـە پەیامەکانیـدا دەڵێـت: بـەر خـەشمی خـوا بکـەوێ_ : (( إن لأئمتنـا مقامـاً لا يصلـه لا ملـك مقـرب ولا نـبي

مرسـل))( مـن عقائـد الشـيعة: ٨/١). بەڕاسـتی ئیمامەکانی ئێمە پلەو پایەیەکیان هەیە کەوا فریشتە نێزیکەکان لە خواو تەواوی پێغەمبەران نەگەشتوون بەو پلەو پایانە.

پێغەمبەری خواوە پیاو پیاو ناوبراوە هەتاوەکو دەگاتە هاوڕێکەی[65].

براکانم خوشکەکانم ئەمانە ناوی ئیمامەکانی شیعەی دوانزە ئیمامین‌و بیروباوەڕیان وایە کەوا پێغەمبەرﷺ بەدەقەوە ناوی ئیمامەکانی بردووەو باسی کردوون‌و دیاری کردوون، هەرئەم دونزەن تارۆژی دوایی‌و نەکەمدەکەن‌و نەزیادیش دەکەن ئەوانیش ئەمانن:

[65] الإمامة والنص، فيصل نور، ص(8).

١_ عەلی کوڕی ئەبو تالیب رضي الله عنه المرتضى ت ٤٠ ک[٦٦] .

٢_ حەسەنی کوڕی عەلی رضي الله عنه الزكي ت ٥٠ ک.

٣_ حوسەینی کوڕی عەلی رضي الله عنه سيد الشهداء ت٦١ ک.

٤_ عەلی کوڕی حوسەین زين العابدين ت ٩٥ ک.

٥_ محەممەدی کوڕی عەلی الباقر ت ١١٤ ک.

٦_ جەعفەری کوڕی موحەممەد الصادق ت١٤٨ ک.

٧_ موسای بن جەعفەر الكاظم ت ١٨٣ ک.

٨_ عەلی کوڕی موسا الرضا ت٢٠٣ ک.

٩_ محەممەدی کوڕی عەلی الجواد ت ٢٢٠ ک.

١٠_ عەلی کوڕی محەممەد الهادی ت ٢٥٤ ک.

١١– حەسەنی کوڕی عەلی العسكری ت ٢٦٠ ک.

١٢_ محەممەد کوڕی حەسەن المهدی ت ٢٦٥ ک.

---

[٦٦] سيرة أمير المؤمنين علي بن أبي تالب رضي الله عنه للصلابي: ص(602)، دارالمعرفة بيروت_لبنان.

## ٢_ سیفەتی نەزانی دەدەنە پاڵ خوا سبحانه وتعالی (البداء ):

وشەی (البداء ) لەزمانی عەرەبیدا بەدوو واتا دێت:

یەکەم: ئاشکرابوون لە دوای نادیاری.

دووەم: بۆچـونێکی نـوێ لــە دوای بۆچـونی پیشــوو ڕاگۆڕین.

(المفــردات في غريــب القــرآن: الراغــب الأصــفهاني، والصحاح: كلمة ال_بدا).

ئەم دوو سیفەتە لەهەر کەسێکدا بەدی بکرێـت ئـەوا نیشـانەی بـێ ئاگـایی‌و نـەزانی ئـەو کەسـەیە، چـونکە کەسێك کەوا شتێکی لێ پەنابێ‌و پاشان بۆی دەرکـەوێ

یان لەسەرەتاوە پێی وابێ ئەمشتە باشە پاشان بۆی دەربکەوێ ئیتر بەتوێژینەوە بێت یان هەر جۆرێکی تر، ئەوا نیشانەی کەم زانستیو سنورداری عەقڵی ئەو کەسە پیشان دەدات، لە هەمان کاتدا ئەوان ئەم دوو سیفەتە ناشیاوە بۆ ئیمامەکانی خۆیان قەبوڵ ناکەن، کەچی دەیدەنە پاڵ خواو دەڵێن ئەمە سیفەتی خوایە (سبحانك هذا بهتان عظیم) ، لەم کارەشیاندا مەبەستێکی گڵاوی تایبەتیان هەیە، ئەم مەبەستەش بۆ ئەوەیە ئەو ئایەتانەی کەوا باس لە چاکیو پاکی ئەبوبەکرو عمرو عوسمانو هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ و تەواوی هاوەڵان دەکات پێی ڕەد بکەنەوەو بڵێن: بەڵێ ڕاستە هاوەڵان لە سەرەتاوە باشبون، بەڵام خوای گەورە نەیزانیوە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ پاشگەز دەبنەوەو هەڵ دەگەڕێنەوە لە دین، ئەمەش

گەورەترین بوهتانو کوفرە بەرامبەر خوای گەورەو بەدەسەڵات.

واتە خوای گەورە نازانێ لە ئایندەدا چی ڕودەدات، بەڵکو لە دوای ڕوودانی شتەکە دەزانێت(پەنا بەخوا)، جاتوخوا گەر ئاوابێ چ جیاوازیەك هەیە لە نێوان بەندەو خوادا، واتە خوا وەك مێژو نوسێك وایەو چاوەڕوانی ڕوداوی شتەکان دەکاتو پاشان دەیخاتە سەر پەڕاوو دەینوسێتەوە (پەنا بەخوا دەگرم لەم تاوانە)، بەڵکو ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾ الأنعام: ٥٩ .

لای خوایە کلیلەکانی زانستی پەنهانی هیچ کەسێك نایزانێ جگە لەو، دەزانێ ئەوەی لە وشکانیداهەیەو ئەوەی لە تەڕانیو ناو دەریاکاندا هەیە هیچ گەڵایەك لێنابێتەوە لە دارەکەی مەگەر پێش لێبونەوەی ئەو زانیبێتی هیچ دانەوێڵەیەك نیە لە تاریکایو ناخی زەویداو نەوشكو نەتەڕ مەگەر لە کتێبی ئاشکرادابێ.

﴿ عَـٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ ٱلۡكَبِيرُ ٱلۡمُتَعَالِ ﴾

الرعد: ٩ . الله زانایە بەهەموو دیارو نادیاریك گەورەو بەهێزە، دورە لەهەموو سیفەتێکی ناشیاو.

ویری الكليني في (الكافي) باب (أن الأئمة إذا شاءوا أن يعلموا علموا) کولەینی پێی وایە کە ئیمامەکانیان هەرکات بیانەوێ بزانن دەزانن. عن جعفر أنه قال : ((إن الامام إذا شاء أن يعلم علم، وأن الأئمة يعلمون

متـی یموتـون وأنهـم لا یموتـون إلا باختیـار مـنهم)) .
لەجەعفەرەوە کە وتویەتی: بەڕاستی ئیمام هـەرکاتێ بیـەوێ کـە بزانێـت دەزانێـت، بەڕاسـتی ئیمامـەکان دەزانـن کـەی دەمـرن، نـاشمرن مەگـەر بـە ئـارەزوو ئیختیـاری خۆیـان نەبێ.ئەمـە قسـەی ئـەو نـەزانو گومڕایەیـە کـە پڕاوپـڕ دژایـەتی لـە گـەڵ قورئـانو فەرمودەی صەحیحدا هەیە. خوای گەورە دەفـەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ ﴾ لقمان: ٣٤.

بەڕاسـتی لای خوایـە زانسـتی قیامـەت، وەزانسـتی چـۆنێتی بـاران بـارین هـەر لای ئـەوە، وەهـەر ئـەوە دەزانێت چی لە منداڵدانا هەیـە، هـیچ نەفسـێك نازانـێ

بەیانی چی دەكات چی دێتە ڕێی، وەهیچ نەفسێك نازانێت لە چ زەویەك دەمرێت بە ڕاستی هەر الله زاناو وورد بینە بە كارە نهێنیەكا.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَفَاتِحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا اللَّهُ لَا يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ إِلَّا اللَّهُ وَلَا يَعْلَمُ مَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ إِلَّا اللَّهُ وَلَا يَعْلَمُ مَتَى يَأْتِي الْمَطَرُ أَحَدٌ إِلَّا اللَّهُ وَلَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ وَلَا يَعْلَمُ مَتَى تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا اللَّهُ)) رواه البخاري:٤٦٩٧.

واتە: كلیلەكانی زانستی نهێنی پێنجن هیچ كەسێك نایانزانێت جگە لە الله، هیچ كەسێك نازانێت بەیانی چ باسەو چی تێدایە جگە لە الله، وەهیچ كەسێك نازانێ منداڵ دان چی تێدایەو شاردویێتیەوە جگە لە الله، هیچ

کەسێك نازانێت کەی باران دێتو دەبارێت جگە لە الله، وە هیچ نەفسێك نازانێت لە کویێو لە چ زەویەك دەمرێت، وە هیچ کەسێك نازانێت کەی رۆژی دوایی بەرپا دەبێت جگە لە الله.

خۆشەویستان ئەم سیفەتە ناشیاوە دەدەنە پاڵ خوای گەورەو ئاوا بەخوا دەڵێن، کەچی تەماشاکەو ئەم هۆنراوەی زاناو شێخی سەردەمیان _ابراهیم العاملی_ بخوێنەوە سەبارەت بە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب خوا لێی ڕازی بێت کەچۆن پێیدا هەڵ دەداتو زیادەڕەوی دەکات لە وەصف کردنیدا، دەڵێت :

أبا حسن أنت عين الإله --      وعنوان قدرته السامية

وانت المحيط بعلم الغيوب -  فهل تعزب عنك من خافية

وأنت مدير رحى الكائنات --   ولك أبحارها السامية

لك الأمر إن شئت تحيي غدا   وإن شئت تشفع بالناصية

ئەی باوکی حەسەن تۆی چاوی ئیلاهی   ناونیشانی هێزی بێ ئەندازەی ئیلاهی

تۆی کە دەورت داوە لە زانستی پەنهانی  دەی شتێك لەتۆ ون دەبێ لە پەنهانی

تۆی کە هەڵسوڕێنەری ئاشی بونەوەری  بۆتۆیە دەریاکانی بێ بنو بێ کۆتایی

بۆ تۆیە فرمان گەر ویستت دەژی بەیانی  وەئەگەر ویستت دەیگری نێو چاوانی

یەکێکی تریان کە ناوی _ عەلی کوڕی سولەیمانی مەزیدیە_ بەم شێوە پیایا هەڵدەداتو دەڵێت: کە ئەمە کورتەیەکە لە هۆنراوەکەی:

أبا حسن أنت زوج البتول ---- وجنب الإله ونفس الرسول
إليك تصير جميع الأمور ---- وأنت العليم بذات الصدور
وأنت المبعثر ما في القبور ---- وحكم القيامة بالنص لك
وأنت السميع وأنت البصير ---- وأنت على كل شيء قدير
ولولاك ما كان نجم يسير ---- و لا دار لولاك الفلك
وأنت بكل البرايا عليم ---- وأنت المكلم أهل الرقيم
فمن ذاك كان ومن ذا يكون -- وما الأنبياء وما المرسلون
وما القلم اللوح ما العالمون ---- وكل عبيد مماليك لك
ومسقي محبيك يوم الورود --- ومنكر في البعث من أنكرك

**ماناکەی:**

**ئەی باوکی حەسەن تۆی هاوسەری فاتیمە، تەنیشتی خوداو نەفسی پێغەمبەر، هەموو کارەکان سەرەنجامیان بۆلای تۆیە، تۆی زانای بەوەی کەلە سینەکاندایە، تۆی زیندو کەرەوەی ئەوەی لە ناو گۆڕدایە، فرمان ڕەوایی دوارۆژ بە بەڵگەوە موڵکی تۆیە، تۆی بیسەرو بینەر، تۆی بەسەر هەموو شتێکدا توانات هەیە، ئەگەر تۆنە بویتایە ئەستێرەکان نەدەجولاْنو بونەوەر بەواوەی تۆوە هەڵدەسوڕێ،**

تۆی زانای بەهەموو بونەوەر، تۆی ئەوکەسەی کە قسە لە گەڵ ئـەهلی ئەشـکەوتدا دەکـەی، ئـەوەی کـەبووەو ئەوەی کەدەبێ، پێغەمبـەران و ڕەوانـەکراوان، قەڵـەمی لـەوح و زانایـان، هـەموو ئەمانـە بەنـدەو مـوڵکی تـۆن، ئاودەری خۆشەویستانت لەڕۆژی تینوێتیـدا، هەرکـەس نکوڵی لـە مانـە بکـات بۆتـۆ وەك ئـەو کەسـەیە نکـوڵی لەزیندو بونەوە دەکات.

## ٣_ قورئانی بەڕێز:

شیعەی دوانزەئیمامو رافضیەکان سەبارەت بە قورئان سێ بۆچونیان هەیە:

یەکەم: دەڵێن قورئان گۆڕاوو مونحەریفەو تاکە کتێبە لە ناو کتێبە ئاسمانیەکاندا کە مونحەریفە، کتێبو سەرچاوەکانیان پڕە لەم قسەو باسانە وەك خاوەنی (( تفسیر الصافي)) الشعبی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: بەڕاستی متمانە پێکراوو کەسی ناوداری ئیسلام موحەمەدی کوڕی یعقوبی کولەینی _ طاب ثراە _ بە هەمان شێوە بیرو باوەڕی وایە بەرامبەر بە گۆڕانو تەحریفو ناتەواوی لە قورئاندا، لەبەر ئەوەی لەم بارەیەوە چەندین ڕیوایەتی گێڕاوەتەوە لە کتێبەکەیدا (( الکافی)) هیچ کامێك لە ڕیوایەتاکانی بە

لاوازو بێ هێز دانەناوە، لە بەر ئەوەی کەوا لە سەرەتای کتێبەکەیدا دەڵێت کە باوەڕی بەهەموو ئەو ڕیوایەتانەهەیە کە تێیدایە. ((تفسیر الصافي)) ص ١٣، (( الإمام الصادق)) لأبي زهرة، ص ٣٢٣)).

هەروەها زانای فەرمودە نوری طبرسي بۆ سەلماندنی تەحریفو گۆڕانی قورئان کتێبێکی گەورەی داناوەو ناوی لێناوە: (فصل الخطاب في إثبات تحريف كتاب رب الأرباب)زیاتر لە دوهەزار ڕیوایەتی تێدا کۆ کردوەتەوە کەوا بەڵگە دەکەن لە سەر تەحریفی قورئان، هەروەها تەواوی بۆچونو قسەی زاناکانی شیعەی تێدا کۆکردوەتەوە کە ڕاشکاوانە باس لە گۆڕانی ئەو قورئانە دەکەن کەوا ئێستا لەبەر دەستی مسوڵمانانداهەیە، بەجۆرێك دەیسەلمێنێ کە هەموو زانایانو فیق ناسانی شیعەی پێشو لەوانو

ئـەوانی دوایشــی دەڵـێن: بەڕاســتی ئائــەو قورئانــەی کەئێســـتا هەیــەو لەبـــەر دەســـتی مســـوڵمانانداپە مونحەریفـو دەستکاری کراوە.

سـەید هـاشمی بـەحرانی دەڵێـت: لای مـن هەیـە لەســەر ڕونــیو ڕاســتی ئـەم قســەی _ واتــا قســەی تـــەحریفی قورئـــان _ لـــە دوای گـــەڕانو بشـــکنی فەرمودەکان بەجۆرێك بڕیار بدرێت بەوەی کەوا ئەم بۆ چونە لە زەروریاتی بۆچونی شیعەیەو لـە گـەورەترینی ئامانجەکانی دەستگرتنە بـە سـەر خەلافەتـدا. (مقدمـة البرهان، الفصل الرابع ٤٩).

دووەم: بۆچـونیان وایـە کـەوا قورئـانی تـەواو حەڤـدە هەزار ئایەتە: ئەوەتا کولەینی کۆتایی دێنێت بە کتێبی (فضل القرآن) بە ڕیوایەتێك لە ئەبو عەبدوڵلا جـەعفری

صـادقەوە کەوتویـەتی: " إن القـرآن الـذی جـاء بـە جبرئیل رضي الله عنه إلی محمـد صـلی الله علیـە وسـلم وآلـە سـبعة عشـر آلـف آیـة " (٢)﴿١٦٦﴾) . واتـە: بەڕاستی ئـەو قورئانـەی کـەوا جبرائیـل رضـي الله عنـە پێی هاتووە بۆ موحەممـەد صـلی الله علیـە وسـلم وآلـە حەڤدە هەزار ئایەتە.

سـێیەم: شـیعەکان پێیـان وایـە کـەوا قورئـانی ئـەوان قورئـانی فاتمیـە _ مصـحف فاطمـة _ تەنانـەت یـەك پیتیشـی لـەم قورئانـەی کەئێسـتا لەبەردەسـتی ئۆمەتدایە نیەو بەڵکو ئەو قورئانە سێ ئەوەندەی ئـەم قورئانەیە، ئەمەش بەڵگە لە کتێبەکانی خۆیان:

أ_ لە عەلی کوڕی سەعیدەوەو لە ئـەبو عبـد الله وە – علیـە السـلام – دەڵێـت: (.. وعنـدنا والله مصـحف فاطمة ما فیە آیة من کتـاب الله، وإنـە لإمـلاء رسـول الله

صلوات الله عليه وآله بخط علي – عليه السلام – بيده) (بحار الأنوار ٤١/٢٦).واتە: لای ئێمە هەیە سوێند بەالله پەڕاوی فاتیمە یەك ئایەتی لە کتێبەکەی الله ی تێدا نیە، وە ئەو پەڕاوە نوسینەوەی پێغەمبەرە صلوات الله عليه وآله بە خەتو قەڵەمی عەلی– عليه السلام –.

ب– لە موحەمەدی کوڕی موسلیمەوەلە یەکێکیانەوە – عليه السلام –: (..وخلفت فاطمة مصحفاً، ما هو قرآن، ولكنه كلام من كلام الله أنزل عليها، إملاء رسول الله صلى الله عليه وآله وخط علي – عليه السلام –) (البحار ٤٢/٢٦).واتە: فاتیمە لە دوای خۆی پەڕاوێکی بەجێ هێشتووە، ئەو پەڕاوە قورئان نیە، بەڵکو کەلامی خوایە ناردوێتی بۆی، نوسینەوەی

پێغەمبەرە صلى الله عليه وآله بە خەتی عەلی– علیه السلام –.

ج_ لە عەلی کوڕی باوکی حەمزەوە لە باوکی عەبدوڵڵاوە – علیه السلام –: (..وعندنا مصحف فاطمة عليها السلام، أما والله ما فيه حرف من القرآن، ولكنه إملاء رسول الله صلى الله عليه وآله وخط علي) (البحار ٢٦/٤٨). واتە: لای ئێمەیە پەڕاوی فاتیمە علیها السلام، دەی سوێند بەالله یەك پیتی قورئانی تێدا نیە، بەڵکو نوسینەوەی پێغەمبەرە صلى الله عليه وآله بە خەتی عەلی.

## خۆشەویستان خاوەن هۆشان

## ئێستاش ئێوەو چەند ئایەتێك بەتفسیری شیعەکان:

١_ تەفسیری ئەم ئایەتە لە تەفسیری قومیدا قال تعالى : (وينهى عن الفحشاء و المنكر و البغي) دەڵێن: فەحشا ئەبو بەکرەو مونکەر عومەرەو بەغی عوسمانە.

٢_ لە تەفسیری قومیداو جگە لەو هاتوە لە ئەبو عەبدوڵلاوەلە فەرمایشتی خوای بڵند مەقامدا: {مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ} عەلیو فاتیمە دووبەحری قوڵن {بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لا يَبْغِيَانِ} هیچکامیان زیادەڕەوی ناکەن بەسەر هاوڕێکەیدا{يَخْرُجُ مِنْهُمَا اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَانُ} دەردەچێ لەوان حەسەنو حوسەین ﴿تفسير القمي: ٣٤٤/٢، تفسير فرات ص: ١٧٧، وابن بابويه/ الخصال ص ٦٥، تفسير الصافي: ١٠٩/٥، البرهان.

ئەگەر بەوشێوەبێ کە ئەوان دەیڵێن ئەوا دەبێت یەکێك لە پێشەوا عەلیو فاتیمە خان خراپبن، کە ئەمەش نەلای سوننەو نەلای شیعە قەبوڵنیە، چونکە هەردوکیان چاكوپاکن، لەبەر ئەوەی خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا بەم جۆرەباسی ئەو دووبەحرە دەکاتو دەفەرموێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا ﴾ الفرقان: ٥٣

واتە: الله ئەو زاتەیە کە دوو بەحری گەیاندووە بەیەك. ئەمەیان شیرینەو ئەوەشیان تاڵە وەلەنێوانیاندا لەمپەرێکو رێگرێکی دانەوەو نایەڵێ تێکەڵ بەیەکبن. جائەگەر وابێ عەلیو فاتیمە بریتیبن لەم دوودەریایە ئەوا یەکیان شیرینەو ئەویتریشیان تاڵە، وەلەنێوانیاندا رێگرێکی بەهێز هەیە کەنایەڵێ تێکەڵ بەیەك بن، دەی

چۆن حەسەن‌و حوسیەن لەم دوودەریای لەیەك جیا پەیدابوون؟!!.

٣_ جارێكی تر وشەی (بعوضة) مێشولەو (الذباب) مێش بە عەلی ماناو تەفسیر دەكەن‌و لەیەكی دەدەنەوە، وەك لە تەفسیری ئەم دوو ئایەتەدا هاتووە، ئایەتی یەكەم لە سورەتی البقرە(٢٦)و ئایەتی دووەم لە سورەتی الحج (٧٣)دا، بۆ دڵنیا بونت تەماشای تەفسیری: القمي: ١/٣٥)، مرآة الأنوار: ص١٥٠)). بكە.

نازانم جگە لە بێ ڕێزیو سوكایەتی كردن چ سودو ڕێزێكی تێدایە كەوا پێشەوای باوەڕداران عەلی كوڕی ئەبوتالیب بە حەشەراتو مێش‌و مەگەز لە یەك بدەیتەوە، ئەمەش لە ڕوی عەقڵ‌و عیلمەوە شتێكی

نەفامانەو گەوجانەیە کەوا مرۆڤێکی بەڕێز ئابەم شێوە بە میکرۆبێکی زیان بەخش لەیەك بدەیتەوە. بۆ زیاتر بەرچاوڕونیت و ئاشنابونت بە گەوجی و گەندەڵی ئەمانە دەتوانی تەماشای ئەو سەرچاوانە بکەیت کەوا لەم نامیلکەیەدا ئاماژەمان پێکردوە.

## ٤_ هاوەڵان :

سەرەتا ئایەتێك لە قورئانی گەورەو فەرمودەیەك لە فەرمودە پڕ حیکمەتەکانی سەرورمان موحەممەدﷺ دەهێنینەوە سەبارەت بەهاوەڵان‌و دواجار بیرو ڕای ئەهلی سوننەو ئینجا بیروباوەڕی شیعەکان بۆ ئەوەی بەڕونی‌و بەبەڵگەوە قسەکانمان بکەین، نەك بە ڕەگەز پەرستی‌و کوێرانە:

یەکەم: خوای بڵند مەقام لە ئایەتێك لە قورئانەکەی خۆیدا بەڕونی مزگێنی رازەمەندی خۆی‌و پاداشتی نەبڕاوەو بێ سنوری بەهەشتیان پێ دەدات‌و دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَـٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَـٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ

وَرَضُواْ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ التوبة: ١٠٠.

واتـــە: ئەوانـــەی لـــە ســـەرەتاوە پێشـــکەوتن لـــە کۆچـــەران و یـــاری دەدەران و ئەوانـــەی بەچـــاکی شـــوێن ئەوان کەوتون خوا لەوان ڕازیە (لە سەر ئـەو کۆشـش و پشـــتیوانیەی کـــە لـــە پێغەبەرەکـــەی خوایـــان ﷺ کردوە) و ئەوانیش لە خوا ڕازین (لە سەر ئـەو پاداشـتە بێ سنورەی پێی بەخشـیون کـە) بـۆی ئامـادەکردوون باخچانێك چەندین جۆگەلە ئاوێکی سازگار بـە ژێریانـدا دەڕووات و تێیـدا دەمێننـەوە بەهـەتا هـەتایی، ئەوەیـە سەرکەوتن و بەهرەمەندی گەورەو بەنرخ.

لـەم ئایەتـەدا خـوای گـەورە باسـی سـێ چـینی سەربەرزو سەرفراز دەکات: یەکەم: ئەو هاوەڵانەی کـە لـە مەککـەوە کۆچـیان کـرد بـۆ مەدینـە لـە پیـاوان‌و ئافرەتـان، کـەوا ئەبوبـەکری هـاوڕێی کۆچـی‌و عمـری چاونەترس لەو تاقم‌و پۆلەن .

دووەم: ئەو هاوەڵانەی کە لە مەدینەدابوون‌و خۆیان بە ماڵ‌و گیانەوە ئامادەکردبو بـۆ ئـەوەی پێغەمبـەرﷺ و هاوەڵانی کۆچ بکەن بۆلایان.

سێیەم: ئـەو کەسـانەی کـە لـە دوای ئـەوان هـاتن‌و بـە جوانی شوێن ئەوان کـەوتبوون، ئەمـەش سـیفەتی ئـەو کەسـانەیە کـە خـوای گـەورە وەصـفیان دەکـات‌و دەفەرموێ:

﴿ وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴾

الحشر: ٨ ـ ١٠.

واتە: ئەوانەی کە لە دوای ئەوانەوە هاتون دەڵێن پەروەردگارا لێمان خۆشبەو هەروەها لەو برانەشمان خۆشبە کە پێش ئێمە کەوتون بە باوەڕ، هیچ ڕق و کینەیەك دامەنێ لە دڵەکانماندا بەرامبەر بەوکەسانەی باوەڕیان هێناوە، پەروەردگارا بەڕاستی تۆ بەلوتف و میهرەبانی.

ئەم سێ چینە دەستەی بەهشتن، بەلام ئەو چینانەی کە سیفەتی ئەم سێ چینەیان تێدا نیە ئەوا

ئـەوان ئـەهل‌و تـاقمی دۆزەخ‌و خـەشمی خـوان، وەك ئەوکەسانەی لە مـڕۆدا هـەن _ وەك شـعەمەزهەبەکان‌و خەواریجـەکان، ئیسـتاو لـە برگـەی چوارەمدا بـەڕونی باسـیان دەکـەین، إن شـاء الله _، لـە بـاتی داوای لێ خۆشبوون بـۆ بـاوەڕدارانی پێشـو بکـەن نـەفرەتیان لێ دەکـەن، لـە بـاتی دەروونیـان لـە ڕق‌و کینـە بەرامبـەر هاوەڵان پاك بکەنەوە، بەڵکو دڵیـان بەرامبـەر هـاوەڵان وەك زبڵـدان وایـە، بـەڵکو خـراپتر، دەی: ﴿مُوتُواْ بِغَيْظِكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ آل عمران: ١١٩.

بمرن بە ڕق‌و کینەتانەوە بەڕاستی خـوا زانایـە بـەوەی لە سینەکاندایە.

دووەم: عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَـالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((لا تَسُبُّوا أَصْحَابِي فَلَوْ

أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلَا نَصِيفَهُ)). اللؤلؤ والمرجان فيما اتفق عليه الشيخان البخاري ومسلم/١٦٤٩.

لە ئەبو سەعیدی خودریەوە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: جنێو نەدەن بەهاوەڵەکانم، سوێند بێ ئەگەر هەریەك لە ئێوە بەئەندازەی چیای ئوحود زێڕ ببەخشێ ناگاتە یەك مشتی ئەوان، بەڵکو ناگاتە نیو مشتیشیان.

سێیەم: پێشەوای ئەهلی سوننە ئەحمەدی کوڕی حەمبەل_ ڕەحمەتی خوای لێبێت_ دەڵێ: (( لە بەڵگەی ڕوونو دەلیلی ئاشکرایە باسی چاکەکانی هاوەڵانی پێغەمبەری خواﷺ بەگشتی، خۆگرتنەوە لە باسی خراپەکانیانو ئەو کێشانەی لە نێوانیاندا

ڕویداوە، هەرکەس جنێو بدات بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ یان یەکێك لەوان یان کەمی بکاتەوە یان تانەی لێبدات یان عەیبێکیان بۆ خەڵکی هەڵماڵێو بڵاوی بکاتەوە یان یەکێك لەوان لەکەدار بکات، ئەوا ئەوکەسە بیدعەچیو رافضیو پیسو سەرپێچی کارە خوای گەورە نەفەرز نەسوننەتی لێ وەرناگرێ)).
((السنة)) للإمام أحمد(ص ٧٨).

پێشەوا تەحاوی لە عەقیدەکەیا _ عەقیدەی ئەهلی سوننەو جەماعە _ دەڵێت: (( ئێمە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوامان ﷺ خۆش دەوێ، زیادەڕەوی ناکەین لە خۆشەویستی هیچکامێك لەوان، خۆمان بەدوورناگرینو بێوەری ناکەین لە هێچکامێك لەوان، ڕقمانە لەو کەسەی ڕقی لەوانەو بەبێ چاکە باسیان دەکات، ئێمە باسیان ناکەین تەنها بە چاکە نەبێ،

خۆشەویستی ئــەوان ئاینـــە، بــاوەڕە، چــاکەیە، ڕقبوونـــەوە لێیـــان بـــۆ باوەڕیـــە، دووڕوویيـــە، سەرکەشیە)). (( شرح العقيدة الطحاوية)) (ص ٤٦٧).

چـوارەم: ئەمــەش بیروبـاوەڕی شـیعەی دوانزەئیمـام دەربـارەی هـاوەڵان: کولـەینی لـە ئـەبو جەعفـەرەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ئەو وتویەتی: هـەموو خـەڵکی لـە دوای پێغەمبەرﷺ دەستەی پاشگەز بوانن(مرتـد) لـە ئیسلام، تـەنها سـێ کـەس نـەبێ، منـیش وتم: ئەوسـێ کەسە کێن؟ ئـەویش وتـی: میقـدادی کـوڕی ئەسـوەدو ئـەبو زەڕی غیفـاریو سـەلمانی فارسـیی رەحمـەتو بەرەکەتی خوا لە سـەریانبێ.(( الروضـة مـن الكافيـة)) (٨/٢٤٥، ٢٤٦) (( الإنتصار للصحب والآل)) ص٧٦.

نیعمەتواللە جەزائیری دەڵێ: ئیمامیەکان بە بەڵگەی ڕوونەوە لە سەر ئیمامەتی عەلین، هاوەڵانیان کافر کردوە، تانەی زۆریان لێداون، ئیمامەتیان داوەتە لای جەعفەری سادق، لە دوای ئەویش داویانەتە لای ئەوە پارێزراوەکانی لە گوناح سەلامی خوایان لە سەربێ، نوسەری ئەم کیتابە لەم دەستەیە سەرفرازە ان شاء اللە.(( الأنوار النعمانية)) (٢/٢٤٤).

محەمەد باقری مەجلیسی دەڵێت: عقيدتنا في التبرؤ أننا نتبرأ من الأصنام الأربعة: أبي بكر وعمر، وعثمان، ومعاوية، ومن النساء الأربع: عائشة، وحفصة، وهند، وأم الحكم، ومن جميع أشياعهم وأتباعهم، وأنّهم شرُّ خلق الله على وجه الأرض، وأنه لايتم الإيمان بالله ورسوله والأئمة إلاّ بعد التبرُّؤ من أعدائهم. (( حق اليقين)) (فارسي) ص٥١٩.

